## دەسپێک

ئەگەر دەرزییەک بە دەستەوە بگرین و لە ژێر پێستی هەر هاونیشتمانییەکی عەرەبی رۆکەین ، تراوێکی سێحراویی لێ هەڵدەقوڵێ.
ئەم ماکە رەوانە، نە نەفتە...و نە خزم و کەسی نەفت. ئەم رەنگە کەسکە بڵێسەدارە زێڕینەی لە نەمان بە دوورە، شێعرە.
گەنجینەی ژیاریی ئێمەش شێعرە نە نەفت.
ئەو گەنجینەیە لە کەمی نادا، هەڵناچۆڕێ، رێکخراوەی "ئۆپێک" حوکمی بە سەردا ناکا، دەوڵەتە گەورەکانیش توانای ئەمار کردن و شاردنەوەیان نیە، چونکە سەرچاوەکەی قووڵایی رۆح و گیانی مرۆڤە، واتە ئەو شوێنەی کەس دەستی بە سەریدا راناگا.

2

گەلی عەرەب مەحکوومە بە شێعر. هەر وەکو هولەند مەحکوومە بە دەریا، ئوستراڵیا بە گەنم،کوبا بە شەکری قامیش، سیلان بە چای، ئەفریقا بە پڵینگ و زەررافە، فەرەنسە بە شەراب و ئیسپانیا بە چاوی رەش.
هەموو زارۆکانی عەرەب کە لە دایک دەبن شاعیرن هەتا راگەیاندنێکی دیکە ...
هەموو منالانی عەرەب پڕۆژەی ئەوە دادەرێژن ببنە شاعیر، هەتا ئەو کاتەی هەل و مەرجی کۆمەڵایەتی و بژیویی ناچاریان دەکەن لەوەی لە خوێنیان دایە لا بدەن، بۆ ئەوە بە زۆر ببنە پزیشک، ئەندازیار، ماڵکڕ و ماڵفرۆش.
گەلی عەرەب تەنیا گەلێکە کە دەچێ بۆ شەوی شێعر، هەر بەو شکۆیەوە دەچێ کە لە زەماوەن یان کێ بڕکێی تۆپێن یان کارناڤاڵی دیلانێ و هەڵپەڕکێی نەتەوەییدا بەشداری دەکا.
ئەگەر فلۆرانس بە میکلانژەوە خۆی رادەنێ،
ئەگەر وێنیز بە شووشەی رەنگاورەنگیەوە،
ئەگەر قودس بە ژمارەی زۆری پێخەمبەر و پیاوە ئایینیـیە پیرۆزەکانیەوە لە خۆی بایی‌یە،
ئەگەر "دیمشق" بە گوڵی سووریەوە دەنازێ،
ئەگەر"بصره" بەوە سەربەرزە کە ئەردی ملیۆن دار خورمایە،
خۆ کۆماری موریتانیای عەرەب بەوە خۆی رادەنێ کە ئەردی ملیۆن شاعیرە.

3

ملیۆن شاعیر؟! گەلۆ شتی وادەبێ؟
لە خەیاڵی عەرەب دا هەموو تشتێ دەلوێ...
کاتێ عەرەب بەوە دڵنیایە کە دەرکەوتەی شێعریی، لە دەرکەوتەی، لۆکە، گەنم و قوماش زیاترە، بۆچی ئێمە ئەو خەیاڵەی لێ ئاڵۆز بکەین؟
ئەز لە بەر خۆڕانان و فیزی نەتەوەیی وا ناڵێم، چونکە دەزانم کە شێعر خاڵی بە هێزی عەرەبە و هەر لە هەمان کاتیشدا خاڵی لاوازیش یەتی. هەر وەها دانی پێدا دەنێم کە شێعر هەر بەو رادەیەی کە گەورەیی و کەرامەتی عەرەبی بڵێسەدار کردووە. لە لایەکی دیکەشەوە لە خۆبایی کردووە، رۆی چواندووە و پاڵی پێوە ناوە زۆر بڕیاری "دونکیشوت"ی بدا کە لەو بڕیار و هەڵوێستانەیدا زۆر کەم هزری شلی نەڕاستی هەیە.
ئەوەی من دەمەوێ لێرەدا تۆماری بکەم ئەوەیە کە شێعر بەند و گرێیەکی سەرەکی لە ژیانی عەرەبدا بووە. ئانیشکێک لە ئانیشکەکانی دەوڵەت بووە. لە باری گرینگییەوە لە دام و دەزگای پاراستن و کار و باری دەرەوە و پروپاگەندە و راگەیاندن کەمتر نەبووە.
لە کۆشکی حاکم دا شێعر بووە.

شێعر لە نوێژگە و لە کۆڕی زانست دا بووە.
شێعر لە قاوەخانە و گەڕەکە کۆنە پڕ حەشیمەتەکان دا بووە.

لە وەزارەتخانەکاندا، دەمێک وەکو راوێژکاری رۆژنامەنووس و زەمانێک وەکو راوێژکاری نیزامی و چاخێکیش وەکو باڵوێزی گەرۆکی بەدەسەڵات, شێعر بووە.

لە نێو ئێمەدا کێ هەیە نەزانێ کە هۆزەکانی عەرەب لە سەرهەڵدانی شاعیردا جەژنیان دەگرت؟ هەر وەکو ئەمڕۆ کە بۆ دیاری کردنی پاپ یان لە کاتی تاج لە سەرنانی قەڕاڵ یان لە دیاری کردنی شاژنی جوانانی جیهان دا جەژن دەگرن.

4

شێعر لە هەموو قۆناغەکانی ژیانی ئێمەدا هەیە. لە کاتی شادی و خۆشیدا، لە جیاتی گوڵەباخ و مێخەک پێشکەشی دەکەین.

لە جەژنی لە دایک بووندا لە جیاتی قوتوە شیرینی و هەڵوا پێشکەشی دەکەین.

لە زەماوەندا دەیکەینە مەلیلە و سەردەستەکانی بووکی پێ دەڕازێنینەوە.

لە کاتی لە دایک بوونی زارۆکان دا دەیکەینە گەردنبەند و لە ملی زارۆکی دەکەین.

لە تەکیە و نوێژگەکاندا دەیکەینە عوود و بۆ رەزانەندی خودا دایدەگیرسێنین.

لە خۆپیشاندانەکاندا شێعر، بۆمبایە بۆ روخاندنی دەور و دووکانی حاکم دەیتەقێنین.

لە کاتی حەزلێکردوویی‌دا دەیکەینە بازنەیەکی زومورود و لە جومگەی گراوی‌یەکەمانی دەکەین.

لە بەرامبەر ئەو دەسەڵاتەی شێعر دا کە هەزار ساڵە و بگرە پتریشی خایاندووە ئێمەش بە رەزامەندی‌یەوە قبووڵمان کردووە و شوکرانە بژێریشی بووین، مرۆڤ چی بە دەستەوە نامێنێ، مەگەر بپرسێ ، گەلۆ ئەم زاڵ بوون و دەسەڵاتدارییە جوانەی شێعر، ژیانی ئێمەی دەوڵەمەند کردووە؟ رازاندوویەتەوە، یان ئەویش وەکو هەموو داگیرکردنێکی سوننەتی، رۆژی لێ دزیوین و لە باتی ئەو گۆیەکی شووشەی رەنگاوڕەنگی داوینێ تا لە کاتی پشوودان دا یاری پێ بکەین؟

بە ووتەیەکی دیکە:

تو بڵێی شێعر پتر لەوەی کە پێویست بووە لە تەمەنی ئێمەی دابڕیوە و بە فیڕۆی داوە؟

گەلۆ عەرەب لە کویلەیەتی شێعردا زێدەڕەوی کردووە تا ئەو جێیەی کە شێعر لە ژیانی‌دا بوەتە خوایەکی دەسکرد وەکو هەموو خوا دەسکردەکانی دیکە؟

ئایا ئەو چۆڕە شێعرە نەژیرانەیەی بە سەرمانەوە نا، بوو بە هۆی لەش ساغیی ئێمە یان بوو بە پەتا و نەخۆشی بۆ ساغوسەڵامەتیمان؟

لەم رۆژگارەدا کە وڵاتانی عەرەبی لە تروپکی سەرنخوونی و هەرەس هێنان دان تۆ بڵێی شێعر تا کوێ و تا چ رادەیەک بەرپرسی ئەم تێکرووخان و هەرەس هێنانە بێ؟

دیارە شێعر وەکو شێعر ، ناتوانێ بە تەنیا باری هەڵە و لاریی و گێڕیی و خوار و خێچی چاخ و سەردەمی عەرەب وە ئەستۆ بگرێ.

شێعر بە تەنیا ناتوانێ بەر پرسی پێنج سەدە بەر بڵاویی، ناتەبایی و لێک دابڕاویی قەومی و فەرهەنگی بێ.

شێعر بۆ مرۆڤ رۆخسارێکی دیکەیە.

ئەگەر شێعرەکەمان ئاوا بێ بە ناچار بۆ خۆشمان ئاوا دەبین!

ئەگەر شێعری عەرەبی لە قۆناغێکدا دامرکا... تێکشکا... یان خۆی کوشت... مرۆڤی عەرەبیش هەر لەو قۆناغەدا، دادەمرکێ، تێکدەشکێ و خۆی دەکوژێ!

هەر کاتێ مرۆڤی عەرەب مەزن بووبێ، شێعری مەزنی نووسیوە. کاتێ کە داکەوتووە و نزم بووە، شێعری نزمی نووسیوە. ئەوەش پێوانەیەکی راستە. ئەو پێوانەیە تەنیا بۆ شێعری عەرەبی نییە. بەڵکوو پێوەندیی بە شێعرەوەیە لە هەموو شوێنێک و هەموو کاتێک...

تامی ترێ لە بنەڕەتی دروستبوونیەوە شیرینە. هەر ترشییەکی تێدایە، هی ئەو مرۆڤەیە کە چاندوویەتی! ترشییەکە لە هەنگورەکەدا نییە.

5

من خۆم ناکەمە وەکیلی شێعر ...

شێعر بۆ خۆی شتێکی ناسکە، وەکو فیلمی ڕەسمگرتن و وێنە وایە کە هەموو بەسەرهاتی ژیانی بنەماڵەیی و عەشیرەتی و خۆشەویستی خۆمانی لە سەر تۆمار دەکەین.

ئەگەر بەختەوەربین، وێنەکانیش باش دەردەچن...

ئەگەر بێ بەخت بین، ڕەسم و وێنەکان دەسووتێن... ئەوەش ئەو تشتەیە کە هەر ئێستا لە بەر چاوە...

ئەم ڕۆژانە هەموو ئەو وێنانەی شاعیر لە بنەماڵەی عەرەبی گرتووە، وێنەگەلێکی سووتاون! نە دەردەکەون و نە گەورە دەکرێنەوە.

لە بەر ئەوە بۆ ئەو وێنانە داوای لێبوردن دەکەم.. چونکە نوور و ڕووناکی‌یەکە خراپە و مەوادی روانگەکە بەر تەسکە.

پاشان هورم و ڕۆئیاکانیش سووتاون... کامێرا و شووشەی کامێراکان سووتاون...چاوگەلی شاعێریش سووتاون.

بەم حاڵە نائاساییەوە و لەو کەش و هەوایەدا وێنەی بنەماڵەی عەرەبی چۆن بگرین ...چون؟؟

6

شێعر چییە؟

مەبەستی ئەم کتێبە ئەوە نییە، ببێتە ڕێنوێنی گەشت و گوزار و بە ئێوە بڵێ، شێعر دانیشتووی کام دورگەیە.لە کامە هوتێڵ نیشتە جێیە. لە کام قاوەخانە دادەنیشێ.تەمەنی چەندە. چاوەکانی چ ڕەنگن و ئەو یارییانەی کە زیاتری پێ خۆشن کامانەن.

ئەوەش لە مەبەستەکانی ئەو کتێبە نییە کە ببێتە پەرتوکێک بۆ بەڕیوەبردنی کار و باری ماڵ، بۆ کەیبانووی ماڵ دیاری بکا کە چۆن سێ کەوچک ئارد و نیو لیتر شیر و سێ هێلکە تێکەڵ بکا و نیو قاڵب ڕۆنی کەرەی لێبدا و ماوەی سێ دەقیقە لە فڕن دا ڕایبگرێ بۆ ئەو ببێتە قەسیدە و هەڵبەست.

ئەو کتێبە لە خەمی ئەوەدا نییە ببێتە سەرچاوەیەک بۆ هونەری سیحر و جادو کردن و بۆ فێربوونی فێڵ و فەرەجی دڵخواز کە چۆن کەروێشک لە کڵاو دێتە دەر و چۆن دەتوانین مس بکەین بە زێڕ. هەر وەها چۆن دەتوانین سەرەڕای شمشێری کێشکچی و ددانی سەگی پولیس خۆ بخزێنینە ئودەی کچی پاشاوە.

ئەگەر دوێتی پاشاش روخساری وەکو مانگ بێ، پەنجەکانی وەکو حەریر بن، کەزییەکانی بە ڕەنگی زێڕ بن، نەشەی بۆ شێعر ببزوێ، بیر لە زەوجین بکاتەوە، ئەوە بەو مانایە نییە کە ئەو لە گەڵ ملیۆن شاعیری عەرەب دەزەوجێ کە بە نۆبە لە بەر دەرکی ماڵەکەی ڕاوەستاون.

کچی پاشاش سەرەڕای بێگەردیی و بۆن خۆشی و کەم تەمەنیی لە هەڵبژاردنی پیاواندا زوو مل نادا و بۆ هەڵبژاردنی شێعریش هەر وایە. سەرەنجام و لە کۆتاییش دا دەگەڵ کەسێک ناکەوێ ، مەگەر مارەییەکەی ئەوینێکی ڕاستەقینە و شێعرێکی ڕاستەقینە بێ، پێشکەشی بکات.

8

شێعر چییە؟

شێعر خاوەنی تەحر و بیچمێکی فوتوگرافی ناسراو نییە. نە تەمەنی دیارە، نە بنە و بنەچەکەشی ناسراوە، کەس نازانێ لە کوێوە هاتووە و بە کامە پاسپۆرت سەفەر دەکا.

پیرەکان دەڵێن: شێعر لە ئەشکەوتێکی ترۆپکی شاخ ڕا داکشا و لە شەقامەکانی شاردا، نان، کتێب و گۆڤاری کڕی و پاشان خۆی شاردەوە و وون بوو.

دانیشتوانی لێواری دەریا دەڵێن: ئەو لە قووڵایی بەحرێ ڕا دەرکەوت، تەواوی ڕۆژ لە گەڵ زارۆکان، شەپۆل و ماسیی ڕەنگ زێڕین یاری کرد و پاشان لە قووڵایی دەریادا گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی.
منالانی شار دەڵێن: شێعر لە دارستانەوە هات، بە دەمیانەوە پێکەنی، چەپکە گوڵ، مانگ، پەپوولە، گەنمەشامی و کولێرەی پڕ لە هەنگوینی دانێ و پاشان لیرەوار قووتی دایەوە.
ژنانی شاریش دەڵێن : ئەو وەکو چۆلەکەی بەهاریی هاتە لایان، بە دەندووک لە سەر لێوی دان، خۆی بە کەزییەکانیانەوە هەڵواسی، یاری بە بازنەکانیان و بە خۆشەویستی و هەست و دڵسۆزییان کرد، پەڕی خۆی لە سەر پۆپەپەشمینەی سەر پێخەفەکان بە جێهێشت و ئینجا لە شەقەی باڵی دا و هەڵفڕی.
مامۆستای قوتابخانەکان دەڵێن ئەو سەر لە بەیانییەک خۆی خزاندە نێو ژووری دەرزگوتنەوە، لە گەڵ قوتابییەکان بە زمانێ دەدوا کە فێری نەببوون. لە سەر تەتەلەش چەند پیتێکی نووسی کە لەوە پێش نەیان دیبوون. پاشان ئەوەی پێگوتن و لێی تێگەیشتن. ئێنجا نایانە سەرشانیان و بۆ خۆ پیشاندان وە نێو شەقامەکان کەوتن و هاواریان دەکرد : شێعر بکریتە وەزیری فەرهەنگ.
لە مەر شێعر و لە ئارشیو و هەڤنفیسی پۆلیس دا کە مزڵ و شوێنی کوێیە، دینی چییە، خاوەنی چ بیر و باوەڕێکە و سەر بە کام وڵاتە، تا ئێستا زانیارییەکی پتەو نەبووە.
تۆ بڵێی شێعر هاونیشتمانییەکی ئاسیایی بێ یان ئەفریقایی؟ ئوروپاییە یان ئەمریکی؟ گەلۆ ڕەنگی پێستی سپییە چاوەکانی شینن؟ یان پێست ڕەشە و قژی گروازە و لوولە؟
یان پێست زەردە و چاوەکانی دوو ئیشارەتی پرسیارن؟
تۆ بڵێی لە دانیشتوانی هیند بێ یان سێند، ئیسکیمۆ، یان هی دوڕگەی عەرەب بێ؟
مەسیحی یە یان مووسایی، موسوڵمانە یان بوودایی یان ئاور پەرست؟
راستاوژویە یان مارکسیست، ئانارشیستە یان نیهیلیست؟
لایەنگری بورژوازییە یان پرۆلتاریا، پێشکەوتنخوازە یان کەونە پەرست، پاشاخوازە یان کۆماریخواز، بە ژنە یان بی ژن، بێتاوانە یان کەتنی کردووە و حوکمی دراوە؟ هەموو ئەو وێنانەی لە ئارشیڤی پۆلیس دان ، بیچم و تەحر یان تا رادەیەک وەکو یەکن و لێک نزیکن و بە پێنووسی ڕەش کێشراونەتەوە هی پیاوێکی روو گرژی، قژ ئاڵۆزن کە جغارە زۆر دەکێشی، کوندەیەک قاوە دەخواتەوە و پێنج کوندەش بیرەی خۆوڵاتی لە رۆژێک دا بە سەرەوە دەنێ. بە رۆژدا جاکەتێکی چەرمی لە بەر دەکا و بە شەویش خەمەکانی بە خۆیدا دەدا.
شێعر چییە؟
شێعر خاوەنی تیۆری نییە.
هەر شاعیر و هەڵبەستڤانێک تیۆری خۆی هەیە.
ئەو وێژەوانانەی هەوڵیان داوە تیۆری بۆ شێعر دانێن، زیان بە شێعرەکانیان گەیشتووە و لە تیۆریش خێریان نەدیوە.
خۆریان فرۆشتووە و خۆیان بە گڵۆپی کارەبای پەنجا شەمییەوە خەریک کردووە. دەریایان فرۆشتووە و خۆیان بە تەماشای تاقمێک ماسیی لە ئەکواریۆم دا رازی کردووە. زاری گراوییە جوانەکەیان فرۆشتووە و گرنگییان داوە بە ژمارەی ددانەکانی.
بەڵام من لایەنگری دەمی گراوییەکەمم نە ددانەکانی، لایەنگری چاوەکانیم نە چاویلکە رەشەکانی.
تیۆری دانان لە شێعردا کاری من نییە.
ئەوەی بۆ من گرنگە شێعرەکەیە.
کەوا بوو شێعر منم، ئێوەن.
شێعر کولێرەیەکی گەرمی دێر و رستەیە کە پێکەوە بەشی دەکەین. شێعر جل و بەرگێکی بێ وێنەیە و تان و پۆی لە هەست و کاردانەوە و کارتێکردنە و ئێمە پێکەوە لە بەری دەکەین.

لەو رووەوە چاوەڕوانی ئەوەتان لە من نەبێ نوسخەیەکتان بۆ بنووسم و ویست و داخوازی ئێوەی پێ بە جێ بێنم.
چونکە ئەوە هاسان نییە، خۆلەمێشی خۆم لە دەفرێکدا کۆ بکەمەوە و وەکو بوودایەک بڵێم: " لە رووی بیولۆژیکی و شیمیایی و ئاناتۆمییەوە ئەوە منم".
خۆلەمێشیشاعێر ئاوا بە هاسانی کۆ ناکرێتەوە.
چڵ ساڵم لە پێش خۆمدا بە ڕێ کردووە، لەو ماوەیەدا لە گەڵ شێعر زەوجیوم و لە گەڵم زەوجیوە.
بیست کۆمەلە شێعرم لێ کەوتوونەوە کە دڵ و مێشکمیان بە تەواوی بە خۆیانەوە خەریک کردووە.
بۆ من نالوێ کە ژیانی خۆم بە زۆر بخەمە نێو " کەپسوول" یکەوە تا خۆ تێ هەڵقوتێن و نووسەر و لاپەڕە فەرهەنگییەکان قووتم دەن.
هەر وەها بۆم ناکرێ هەزاران ژان تێکەڵ بکەم و بیانکەمە ژنێک و بە ئێوە بێژم: ؛ ئەوە خۆشەویستەکەمە؛.
ئەوە غەدرە لە خۆشەویستەکەم و هەر وەها غەدرە لە خۆشم.
شێعر چییە؟
شێعر نووسین چەندە هاسانە و باسکردنی چەندە گران.
شێعر هەڵپەڕکێیە، لێدوان و باسکردنی شێعر زانستی چاوەدێری کردنی هەنگاوەکانە.
بە ئاشکرا دەڵێم پێم خۆشە هەڵپەڕم و نامەوێ بیر لە بزووتنی هەنگاوەکانم بکەمەوە. چونکە هەر کە بیر لەوە بکەمەوە کە چ دەکەم، رێک وپێکی هەنگاوەکانم نامێنن.
شێعر هەڵپەڕکێ بە ووشەیە.
هەڵپەڕکێیە بە هەموو بەشەکانی دەروونییەوە، بە هەموو بزووتنی دیار و نەدیارییەوە، بە هەموو چینەکانی بەر چاو و داپۆشراوییەوە، بە هەموو ئاواتی لواو و نەلواوییەوە، بە هەموو هەست و ئاگاداریی ژیرانە و نەژیرانەیەوە. ئەوانەی کە پەخشان دەنووسن، بە چیرۆک نووس و شانۆنامە نووس و داستان نووسەوە چ گیر و گرفتیان بۆ نووسین نییە.
ئەوانە بە شێوەی سروشتیی بە رێدا دەڕۆن. بە سەر رێی سەنگچن و بەرد رێژکراوی تایبەتیدا دەڕۆن، بۆ ئەوانەی هاتوچوو دەکەن، دێن و دەچن و پیاسە دەکەن.
بەڵام هەڵپەڕکێی شاعێر ترسێنەر و زەندەق بەرە، لێرەدا سەماکەر لە لەشی خۆی دوور دەکەوێتەوە و لەو ئاهەنگ و نەوایەی دانراوە لا دەدا هەتا خۆی ببێتە ئاهەنگ.
ئەز هەڵدەپەڕم بەڵام نازانم چۆن؟
شێعر دەنووسم، وەک ماسیی کە نازانێ چۆن چۆن مەلە دەکا.
وەکو کەروێشک کە نازانێ چۆن هەڵدێ، وەکو مەمک کە نازانێ چۆن دژایەتی قانوونی کێشی زەوی دەکا.
پەڕەی گوێم دەبزوێن. یەک دووانێک لە باڵەکانم ڵێدەدەن. پەڕم لێ قرژ دەبن، ئارەق دەکەم. نوقم دەبم.
لەت و کوت دەبم. شێعر هەر وەکو تیری ئاورین لە لەشم دەردەکەون. هەر وەکو گوللە کە لە خانی دەمانچە دەردەچن.
شاعێر بە شێوەیەکی نەخوازراو لە شێعرەکەیدایە. ئەو لە شێعرەکەیدا قەتیس و زیندانییە. هەر وەکو ماسیی کە قەتیسی ئاوە، نە دەتوانێ خۆی لێ دەر باوێ و نە دەتوانێ لێی رزگار بێ.
تا ئەو کاتەی شێعر وەکو خەنجەرێکی برونزیی سوورەوە بوو لە لەشی شاعێر رۆکراوە، بۆ ئەو دژوارە ئەندازەی راستەقینەی برینەکە، هەر وەها سنووری راستەقینەی کێردەکە بزانێ، چونکە گۆشت و خەنجەرەکە بوون بە یەک.
بیر کردنەوەی شاعێر لەو تشتەی کە لە دەروونیدا روو دەدا، بۆ شاعێر کارێکی دژوارە.
ئاوێنەش هەر ئەو گیر و گرفتەی دەبێ کە بیەوێ لە خۆی بڕوانێ و گوڵیش هەر وەها ئەگەر هەوڵی ئەوە بدا بۆنی خۆی هەڵمژێ.

شێعر چییە؟

ئەز هیچ لێکدانەوەیەکی پەسەنکراوم بۆ ئەو هەژانەی بە ژێر رووبەری پێستم دا رادەکا نییە.

لە کوێ را دێ و بۆ کوێ دەچێ ؟

من بە ملکەچی و سەر سوورمانەوە لەو هەژانە پێشوازی دەکەم و لە ژێر ژیلەمۆی خۆم و وێرانییەکەم دێمە دەرێ و نازانم چ رووی داوە.

چاوەڕێی دەرچوونی رۆژنامەی سەرلە بەیانی دەکەم، بۆ ئەوە بزانم داخوا ناوم لە ریزی مردوواندا بووە؟

هەر وەکو کاتی هاتنی بوومە لەرزە دیاری ناکرێ شێعریش کات و ساتی بۆ دیاری ناکرێ .

شێعر هێرشێکی کتوپڕە رەهۆڵ و کەلەبەرێکی گەرە دەخاتە هێمنایەتی و ئۆقرەگرتووی ئێمەوە و بەر لەوەی پێیبگەین خۆی دەکێشێتەوە.

رۆژی شێعر وەکوو رۆژی دەریا درێژە .

ماسیگر و ماسی، وەکوو راوکەری وشە، بە نهێنی، کتوپڕ، بەو دەنگە کە لە قووڵایی ڕا دێ سات و سەودا دەکەن.

من لە لێواری کاغەز دادەنیشم. چاوەڕوانی ماسیی تازە بە رەنگ و ئەندازەی تازە دەکەم بەڵام دیارە ئەو ماسییانەی کە راوم کردوون و لە قەرتالەکەم هاویشتوون سەرنجم راناکێشن. چونکە هێمانی جوانی و سەرسوورمانیان لە دەس داوە.

ئەوانە بوونەتە شووشە ماسی.

ئەو شێعرانەش بوونەتە شووشە شێعر.

ئەوە یەکەمین بەرهەم و دەسکەوتی منە لەو رووداوە.

ئەوە حالەتی تایبەتیی منە. بۆی هەیە و دەکرێ هەژانی کەسێکی دیکە لە هی من بە پێی پێوانەی "ریشتر" بەهێزتر یان بێهێزتر بێ.

لەوانەیە هێندێک شاعێری دیکە راوەماسی خۆیان بە دینامێت بکەن یان ماسی"سەهۆڵ بەستتو" بگرن.

بەڵام ئەز ماسی خۆم بە دەزووی لەسەرخۆیی راودەکەم و بە بێئەخلاقی وز ناڕەوا لەگەڵ ماسی یان لە گەڵ بەحر ناجووڵێمەوە.

لەو رووەوە پێویستە و لە هەر شاعێرێک داوا دەکرێ . ئەزموونی خۆیمان لە مەڕ شێوەی پێشوازی کردنی هەژان و بوومەلەرزەی دەروونی خۆی و پێشوازی کردن و رووبەرووبوون لە گەڵ ماسییەکان بە ئێمە پێشکەش بکا. چونکە زۆر وا هەیە زانیاری زیاتر و ئەزمخوونی پتر بۆ کامڵتر کردنی هەڤنفیسی شێعر یارمەتیمان بدەن.

ئێمە هەروا بە دەروی پشتوێنەی ئەستێرەی شێعردا دەخولێینەوە.

ئەگەر ئێمە زاراوەی شای بۆ دابەش کردنی گەرماوەکانی دیمشق کە بە ( بەرانی ) و (جوانی) دابەش دەکرین و بە کار بێنین. ئێمە هەروا لە بەشی بڕانی شێعر داین بەڵام کلیلەکانی بەشی جوانی لە لای من نین. هەر وەها بە تێرا دیوی دەڵێم. وەکوو کلیلی ماڵەکانی غرناتە لە لای کەس نین.

بەڵام من ئاواتەکانتان ناشەوتێنم. دیارە ئەوەش رووی راستییە و دەمتوانی هەر لە هەوەڵەوە بە پێناسەیەکی رازاوە و رەوان دەمتان چەور کەم و بەرتیلتان بدەمێ.

بەڵام لە راستیدا لە ئێوە و لە شێعر شەرم دەکەم.

چونکە درۆکردن لە شێعردا حەرامە.

دەمتوانی بچمە ئەزموونگە و لابراتور و دەیان نموونەی کلاسیک لە مەڕ پێناسەی شێعر رێک خەم و بڵێم:

1– شێعر ئەو زمانە پتەو و مەزنەیە کە هەموو زمانەکانی پێشوو هەڵدەوەشێنێتەوە و لە سەرڕا دایان دەڕێژێتەوە.

2– شێعر ئەو کەلام و ئاخافتنە شێتەیە کە هزر و ژیری لە کەمی دەدا و هەرچی پەرچێتییەکە کۆتایی بە هەموو نەزم و نیزامێک دێنێ.
3– شێعر شۆڕی سەرکەوتووی ژیارییە کە مرۆڤ بە هۆی ئەوەوە دژ بە دەروون و نەفسی خۆی رادەوەستێ بێ ئەوەی توند و تیژی بە کار بێنێ و خوێن بڕێژێ.
4– شێعر ئەو هونەرەیە کە دوور لە دەسەڵاتی قانوونە و تروپکی دادگەریی نیشان دەدا.
5– شێعر ئەو هەژانە نائاسایی و بەدەگمەنەیە کە دێ و دەڕوا و لە پاش خۆی و گەنم و گوڵە باغ و هێشووە ترێ بەجێ دێڵێ.
6– شێعر ئەو پاسپۆرتە کە رێگەمان پێدەدا بە نێو دەروونی خۆماندا هات و چۆ بکەین و ئەو وڵاتانە بدۆزینەوە کە لەمەوبەر پێمان نەدەزانین .
7– شێعر ئەو دەستە ئەفسوونکارەیە کە قەوارەی زەمان و رێک و پێکی تشتان هەڵدەوەشێتەوە.
8– شێعر جەژنی یاریکردن بە ئاگرە کە گڕ لە ئاو بەر دەدا، بڵێسە لە دار هەڵدەستێنێ، گڕ دەخاتە لەشی زەمانەوە و یاریگەر و تماشاچی وێکڕا دادەگیرسێنێ.
9– شێعر ئەو دەوا ودەرمانە پزیشکییەیە کە ئێمە نازانین هەڤدودانینەکەی چییە و چۆن چێ کراوە و کاتێکیش خواردمان پشوومان پێی سوار دەبێ و خەوەکەمان پێی تێکدەچێ و لێدانی رێک و پێکی دڵمان لێ تێک دەدا.
10– شێعر ئەو تەنیا شێتییەیە کە حکومەت ناتوانێ هەر بە هۆی ئەوەوە لە شێتخانەت توند کا و ناشتوانێ لە نێو کۆمەڵگاش دا بەرهەڵدات بکا تا لە بەریەکی بڵاو نەکەی.
11– شێعر ئەو کۆمەڵە پرسیارەیە کە وەڵامیان نییە و کۆمەڵە خەونێکن کە لێکدانەوەیان نییە.
12– شێعر تینی ئازادی و سەربەستیە، شێعر بارانی خەمە کە لە ژێر پێستی گەڵاندا کۆ دەبێتەوە و ساڵ و سەردەمان دەخایەنێ هەتا گوڵ و گوڵیک و مانگ و یاقوت و پێشمەرگەی سەر لێ هەڵدەدا.
ئەمانە کۆمەڵێک پێناسە بوون کە لە گەڵ جوانترین ئاواتەکانم بۆ ئەو کەسانەی یکە لایەنگری کۆکردنەوەی پێناسەن پێشکەشیان دەکەم.
دیارە ئەوانە نە پڕ بە پێست و تەواون نە خاوەنی تایبەتمەندی یەکانی زانستین و نە ئۆقرە گرتوون و نە گشتیین.
تا ئەو کاتەی شێعر ئەو بزنە کێوییەیە کە خووخدەکانی نازانین و لە سروشتی بێ ئاگایین و نازانین نیشتەجێی کوێیە و چۆن زاوو و زوو دەکا، هەر هەوڵێکی ئێمە بۆ دیاریکردنی پەسنەکانی و ناسینی خووخدەی و سروشتەکەی باسەکە دەکێشێتە نێو چوار چێوەی خورافاتەوە.
نازانم، نازانم، نازانم.
شێعر لە نێوەوە دەمسمێ و کونم دەکا.
ناشزانم راچڵەکێنی شوێنی برینی نیزەتان چۆن بۆ باس بکەم.
ئەو کەسەی پێتان دەڵێ کە ئەو دەیزانێ، وێدەچێ جاڕچییەک بێ لە کاتی راهێناندا. یان نووسەرێکی دەرەجە دە. یان خاوەنی قاوەخانەی رۆشنبیریی یان قەوان فرۆش بێ. یان کەڵە شێرێک بێ کە هەموو بەیانان رۆشنبیری خۆی لە نێو ئێمەدا تاقی دەکاتەوە.
بەڵام منی سەربڕاو بە کێردی شێعر، بە هەموو لارەملی و مل کەچییەوە دەڵێم: نازانم شێعر چییە؟
شاعیر نووسەرە. بەڵام خرابترین کەس ئەوەیە کیمیای نووسین شی دەکاتەوە. شاعیر لە نێو ئاو دایە و ئەوەی کە لە نێو ئاودا بێ رووبەری دەریا نابینێ. زانیارییەکی راستەقینەی لەو شەپۆلە پڕ گرێ و گۆڵانە نییە کە بە سەر بزووتنەوەکەیدا فەرمان دەدەن.
لێکدانەوەی شێعر وەکو لێکدانەوەی خەون پڕە لە درۆ و دەلەسە.
شێعری شرووە کراو ئەو خەونەیە کە بڕیاری کوشتنیمان داوە.
ئەگەر شێعر دار بوایە، لە توێژەکانی ڕا هەموو مێژووی دارەکەمان دەردەخست.

ئەگەر شێعر بەرد بوایە پاش پشکنینی لە ئەزموونگە و لابراتۆردا لە هەموو مێژووی دارکە ئاگادار دەبووین.
بەڵام قەسیدە باڵندەیەکی ئەفسانەیی‌یە. ژیان و مێژوو و گۆی زەوینی لە کۆڵی خۆی شەتەک داوە و دەفڕێ.
ئێوەش لە منتان دەوێ بە دوای ئەو باڵندە ئەفسانەیی‌یەدا بڕۆم و بچمە ئەشکەوتی چیاکەی و پێتان بڵێم چۆن دەخەوێ، چۆن دەخوا، چۆن لە گەڵ مێیەکەی جووت دەبێ و چۆن هێلکەکانی لە قەڵەشتی رەوەزەبەردان دادەنێ. باوەڕیشم پێ بکەن من زۆر جار هەوڵم داوە، هێلکەیەک لەو هێلکە زێڕینانەتان بۆ بدزم و پەڕێک لەو باڵە رەگینانەی بۆ ئێوە لێکەمەوە.
بەڵام باڵندەی شێعر هەر کاتێ شکی خۆتێهەڵقوتینێکی کردبێ و بۆنی غەریبەیەکی کردبێ، بووەتە هەورێکی بنەوش و وەکو رۆحێکی بێگەرد لە بەر یەک بڵاوبووە. ئەگەر چی گرتنی ملی شێعر کارێکی نەلواوە یان واویدەچێ، ئەوە بەو مانایە نییە کە پێشی هێنانەگۆڕی هێندێک بیروبۆچوونی من لە دەورووبەری شێعر بگرێ.
ئەم ریزە بیروبۆچوون و فتوایانەی من تەنیابیر و بۆچوون و فتوای تاکە کەسین و تایبەت بە خۆمن. ئەمانە ئەزموونی شێعر بەستەبەندی ناکەن چونکە شێعر حاڵەتێکە کە هەرگیز سەقامگیر نابێ، نە بەستەبەندی دەکرێ و نە ئامار دەکرێ.
**یەکەم** : بە بڕوای من شێعر پڕۆژەیەکی شۆڕشگێڕانەیە، مرۆڤێکی توورە دایدەنێ و لە دووی دەدا و و مەبەستیشی ئەوەیە بەو کارەی روخساری جیهان بگۆڕێ. شێعرێک هەژان و جموجۆڵ لە نوێژی زەوەیندا پێک نەهێنێ و قەڵەشێک نەخاتە سەر نەخشەی جیهان و مرۆڤایەتی، ئەو شێعرە بایەخی نییە.
**دووهەم** : دەرچوون لە ژێر دەسەڵاتی قانوون: ئەوەش تایبەت مەندی شێعرە. شێعرێک ئەو پەسەنەی نەبێ و لە گەڵ سەردەمەکەی خۆی بەربەرەکانی نەکا و لە گەڵی لە کێشەدا نەبێ بایەخی نییە.
لەو سەردەمەی ئێستا کە عەرەب تێدایە هەست بە پێویستی و بوونی شاعیری هیستریکە. ئەوانەی ناپرنگێنەوە و خۆپێدا دەدەن، لە چراسوور تێدەپەڕن و بۆمبای کاتی لە لە ژێر واگۆنی ئەو قەتارە کۆنە دادەنێن کە ئەبوجەهل و دەست و پێوەند و ژنەکانی ، پشیلە و گەماڵەکانی سوواری دەبن.
**سێهەم**:هەر قەسیدەیەک بێ لە بەر گرتنی ئەوەی کێ نووسیویەتی یان لە چ چاغ و سەردەمێکدا نووسراوە ، تێکۆشانێکە بۆ داڕشتنەوەی ئەندازیاری رۆح و گیانی مرۆڤایەتی و داڕشتنەوەی بناغەی ئەم جیهانە.
لەو رووەوە ئەو شێعرەی دەوری کامێرای وێنەگر بگێڕێ بایەخی نییە.
کەوابوو شێعر هەر یەکەم نوسخەیە و هەر چی لە بەری کێشرابێتەوە دەستکرد و قەڵبە.
**چوارەم**:شێعر دەیان تەقینەوەی بچوک لە نێو زماندا پێکدێنێ, پێوەندیی مەنتقیی لە ووشەکاندا دەپسێنێ و مانا و چەمکی وشەدانیی و زاراوەیی دەگۆڕێ و تاکەکانی قەسیدە وەکوو ژمارەکانی کاتژمێری فوسفوری دەدرەوشێنەوە.
**پێنجەم**: شێعر گوریژکەیەکی جوان و بزوز و بەهەڵلا و هەنگامەیە.
شێعر نابێ بە هیچ قیمەتێک خوی منداڵییەکەی وەلانێ. پێویستە مەیل و وازی گەمە و هاروهاجی هەر بمێنێ.
لە سەر شێعر پێویستە هەدا نەدا و نەسەکنێ. گەورە نەبێ، زوو نەخەوێ، گوێ لە مستی دای و باوی نەبێ,دەس لە دووچەرخەکەی، قوتوی رەنگەکانی و فرۆکەی کاغەزەینی هەڵنەگرێ. حاشا لە راستی گوڵ، قورواق و جرجانەوەری بچوک کە بە میوانی لە گیرفانی پانتۆڵە کورتە هاوینیەکەی راکردوون، نەکا.
پێویستە شێعر خۆی بە هزر و ژیرییەوە هەڵنەپەسێرێ، نەکەوێتە نێو چەسپی درووشم ئیدیولۆژی، کامێرا و جەژنەوە.

داوای لێدەکرێ نەزەوجێ، خوێندن تەواو نەکا کڵاوی ئاکادیمی و زانکۆیی لە سەر نەنێ. چونکە هیچ کڵاوێک بە سەری شاعیر ناکا.

شەشەم:شێعر داگیر کردنی جیهانە بە ووشە.

شێعری باش دەبێ بە زۆر دەست بە سەر تیشک دا بگرێ. تیشک بشکێنێ, نەخشە و پلانی شتان بشێوێنێ.

"متنبی" داگیرکەری زەمانی خۆی بوو.

"ابونەواس" داگیرکەری زەمانی خۆی بوو.

"عروە بن الورد" داگیرکەری چاخی خۆی بوو.

"دیک الجن الحمصی" داگیرکەری کاتی خۆی بوو.

هەروەها "رامبۆ، بودلیر، فیرلین، لورکا، پابلۆ نیروادا" داگیرکەرانی رۆژگاری خۆیان بوو.

مێژووی شێعر بە دەستی هەموو ئەو شاعیرانە نووسراوە.

بەڵام شاعیری دەستەمۆ ن دەروێش و بەنەزم و دیسیپڵینی وەکوو"کاتژمێری ئۆمێگا" گەواهیی رەفتار پەسنی خۆی لە کوێخای گەڕەکەکەی وەردەگرێ.هەروەها کارێک لە بەشی ئارشیوی وەزارەتخانەیەک وەردەگرێ.بەڵام ئەم جۆرە شاعیرە هەرگیز پێیان نانێنە نێو کۆشکی شێعرەوە.

لە پێوەندی لە گەڵ خۆمدا من گەواهی پەسەن کرداری و رەفتار باشی لە کەس داوا ناکەم .

من تەنیا رەزامەندی شێعرم دەوێ.

حەوتەم: شێعر سەربزیوی‌یەکی مەزنی زەمانە بە دژی هەموو تشتێکی خووپێگیراو و ناسراو و سەقامگرتوو.

ئەو شاعیرانەی ( بە سەر دیواردا دەڕۆن و دەڵێن: خوایە ئاگات لێم بێ ) لە سندوقی نەفتالیندا دەمرن.

چونکە شێعر بە ووشە شەڕ دەکا و کەسیش ناتوانێ قەسیدە بگرێ و لە بەندیخانەی پەستێوێ.( مەگەر لەو رۆژ ە پیرۆزەی عەرەبدا نەبێ وا لەو جێگەیەی مەزنێکی لێ نییە، مەگەر حوشتر نەبێ یان ئەو شوێنەی کە قەسیدە لە گەڵ ژنانی خۆفرۆش و قاچاخچییانی سیغاری ماڵبرۆ دەخرێتە گرتووخانەوە.)

هەشتەم: ئەرکی شێعر لە دەرەجەی یەکەمدا هاندەرانەیە نە هاوڕێی و نە هاودەنگی کردن.

ئەرکی شێعر لەق کردن و چێوەخرتەدانی پێوەندی نێوان مەرۆڤ و جیهانە، نە سەقامگیر کردن و لە گەڵی رێککەوتن.

ئەو شێعرەی حورمەتی کۆمەڵ خەوشدار نەکا، باوەڕەکانی نەهەژێنێ یان ئاگر لە خوا دەسکردەکانی، بۆچوونەکانی، خوو و خدە و عادەتەکانی بەرنەدا لە ریزی شێعر داناندرێ.

بە کچییمانەوەی کۆمەڵ شتێکی خەیاڵییە، سەربەمورمانەوەکەشی درۆیەکی مێژووییە.

هەموو کۆمەڵگاکانی جیهانیش ئیدیعای دەس وێنەکەوتوویی و پاقژی دەکەن. تا ئەو کاتەی شاعیر دێ و هەڤڤیسی سەرشۆڕیی هەڵدەداتەوە. تەقە لە بڕوای پڕوپوچ دەکا.ئینجا خوێنی سوور لە لەشی دادەچۆڕێ. ئەگەر شێعر مل کەچی ئەو پەسن کراوانەی کۆمەڵ بێ و کڵاوی رێز و حورمەتیان بۆ بەرزکاتەوە، سوژدە بۆ خوای خورما بەرێ ، شک نەکاتە فەلسەفەی خنفشاریەکە دەڵێ:( باشتر لەوەی بووە نابێ). بەڵام لە شێعردا جیا لەوەی حیکمەتە راستەقینەیە نییە کە دەڵێ: (باشتر لەوەی لەمەولا دێ نییە.)

بەو مەبەستە قەسیدە دەبێتە پەیمانێکی ژێر پێخراو، جێ لەق و گۆترەیی.

ئەوە نە لیرەیەکی زێری عوسمانییە کە ناوئاخنی لۆکە بێ، یان پەپوولەیەکی مۆم ئاژەنکراو کە بە دەرزی لە دیوار توند کرابێ.

بەو بۆچوونەش شێعر تیرێکە بەرەو دادێ دەڕوا و نووسراوەیەکی هیرۆگلیفی نییە.کە تابووتی بەردینی پێ نەخشێنرابێ.

شێعر هاونیشتمانی شاری نایە. خەڵکی وڵاتی بەڵێ نییە.واتە شێعر لە بنەڕەتەوە کارێکە لە کارەکانی بەرهەڵستکاران، نە کاری قەرەواشان، کاری دەست بەسنگەوەنان و ڕەتکردنەوەیە نە مل دانەواندن و قبوڵ کردن لەو ڕووەوە هەر هەوڵ و تێکۆشانێک بۆ ڕام کردنی شێعر یان ئەرک پێ ئەسپاردنی شێعر، شێعر ئەکاتە ئەسپێک لە تەویلەی دەسەڵاتدا. یان دەیکاتە سەگی پاسەوانی بەر دەرگای سوڵتان.

دەهەم:هەروەها پێم وایە شێعر پەیامێکی توند و تیژی بە گڕە و شاعیر بۆ جیهانی دەنێرێ.

ئەو کەسەی پەیامەکەی بۆ ناردراوە لە شێعردا هێمانێکی گرینگە. پەیامێک کە ڕووی لە کەس نەبێ وجوودی نییە. دەنا دەبێتە زەنگۆڵەیەک کە لە نەبووندا لێدەدرێ.

گیروگرفتی شاعیری عەرەبیش ئەوەیەکە ناونیشانی خەڵکی ون کردووە.ئەو لە ئیشکانییەکە و خەڵکیش لە ئیشکانییەکەی دیکەن. لە نێوانیشیاندا دەریا دەریا فیزی مەزنێتی و خۆبەزل زانیی و خەڵک بە کەم بینی و گریمانە و وەرهەمی گەورە گەورە هەیە.

لە جیاتی ئەوە ڕۆشنبیری شاعیر ببێتە کەرەستەیەک بۆ لە یەکتر حاڵی بوون و نزیک بوونەوە، ئەوە بووەتە قەڵایەکی فیز و لوت بەرزی و لە خۆبایی بوون کە کەسی تێناچێ، تەلدڕووشی بە دەوردا کێشراوە و کەس ناوێرێ لێی نزیک بێتەوە. ئەوە لە بەر چی وایە؟

لەبەر چی نامەبەر شێعری زۆربەی شاعیرەکانمان دەباتەوە بۆ خۆیان؟

چونکە ئەوانە ناونیشانی خەڵکیان لە بیرچوون. یان خۆیان لێ گێڵ کردوون و لە بیریان بردوون، یان خۆیان لە وارشی زمان دوور خستووەتەوە .

زمانیش وەکوو ڕێگەی هاتوو چوو وایە.پێویستە خەڵک هاتووچووی پێدا بکەن و بێن و بچن، لەوێ چاویان بە یەکتر بکەوێ لە یەکتر جیا ببنەوە، لە گەڵ یەکتر بدوێن و لە یەکتر حاڵی بن. هەر بەو جۆرەی شەقامە ڕێ بۆ هاتووچووی تاکە کەسی نییە، زمانیش بۆ ئەوە داناندرێ تاکە کەسێک پێی بپەیڤێ.

بەڵام شێعری نوێ یان زۆربەی شێعرە نوێیەکان نە ددان بە مەنتیقی گەشە کردنی وشە دادەنێین، نە بە مەنتیقی شەقامە ڕێ بۆ ترۆمبیل,

من بەشێکی زۆر لەو شاعیرە نوێ نووسانە کە زۆربەیان چەپاژۆ و کوموَنیست و پێشکەوتنخوازن بەوە تاوانبار دەکەم کە هەوڵ دەدەن سیستمی دەرەبەگەیاتی شێعری بە سەر گەلی عەرەبدا بسەپێنن. ئەوەش جیاوازی نییە لە گەڵ ئەو دەرەبەگایەتییە فەرهەنگی و فیکرییەی کە ئەمیرەکان لە سەدەکانی نێوەڕاستدا دایان سەپاندبوو.

قەسیدە چییە؟:

قەسیدە جێ برینێکی ڕازاوەی نیزەیە کە بە دەورییەوە گەنم و گوڵ و نوعمانی شین دەبێ.

ئەو جێ برینە لە گەڵ هەموو جێ برینەکانیدیکە جیاوازە. چونکە ڕەنگەکەی کەسکە.

جێ برینەکە و خوێنی دووانی لێ دەچۆڕێ.برین تێکەر و برین تێکراو. شاعیر و شێعر پێشکەشکرا.

قەسیدە کارێکی هاندەرانەی هەرە بەرزە شێعر جۆلانێ نییە بۆ خاو کردنەوە وەنەوس دان و دەخەو کردن.

قەسیدە بە لای منەوە نە حەبی والیۆمە، نە کەرەسەی سەرخۆش کردن و نە پاڵشتی پەڕی چۆلەکە.

قەسیدە میوانداری میوانداری نێو فرۆکە نییە بۆ ئەوەی ئاسوودەی و ئاسایشی ئێوە دابین بکا ، بە پێچەوانە قەسیدە تێدەکۆشێ ئاسوودەیی ئێوە بشلەژێنێ و لە خشتەی بەرێ.

شێعر هەڤبەشی سەیر و سەیاحەت نییەکە بەرنامەی چونە هوتێل و دیتنی شانۆو ئاسەواری مێژوویی بەرێوە ببا.

قەسیدە قەتارێکی بەهەڵکەوتە، کەس لە کاتی هاتووچوون و هاتنەوەی ئاگادار نییە، قەسیدە نە شوێنی ڕیزگرتنە و نە ناوەندی خلیسکێنی سەر سەهۆڵ.

قەسیدە دەفری بیرەی سارد نییە کە تینی گەرمای هاوینی ئێمە کەم کاتەوە . ئەرکی قەسیدە هەڵیساندنی ئاگرە، نە دامرکاندنی گڕ و بڵێسە.هەر بەو شێوەیەی فەرمانبەرانی دایرەی دامرکاندنەوەی ئاگر ئەرکی خۆیان بەرێوە دەبەن.

ئەرکی قەسیدە ئەوەیە دژایەتی هەموو دەستوورێکی هاتووچوو بکا نە ئەوە ببێتە پۆلیسی هاتووچوو.

ئەرکی شێعر ئەوەیە خۆی بە دەریادا دا. بێ ئەوەی بەرگەی بیمەی لە دەس دابێ شێعری ئێمەی عەرەب گیروگرفتەکەی ئەوەیە کە چێژی هەتاوی مەدیتەرانە و پاڵدانەوە لە ژێر چەتری هێمنیی و ئاسوودەیی پێ باشە.

گیرو گرفتی شاعیرە عەرەبیش ئەوەیە، دەیەوێ کچی پاشای دەسکەوێ بێ ئەوەی مارەییەکەی بداتێ، یان لە گەڵ پاسەوانەکانی دوَیتی پاشا بکەوێتەشەڕ و کێشەوە.

دیارە لەو شوێنە ژنی جوان بە بێ شەڕ و کێشە دەس ناکەوێ.

شێعریکیش دوور لە پشتوێنەی خۆ لە مەترسی هاویشتن و کێبڕکی و شەهید بوون بێ، بایەخێکی راستەقینەی نییە.

شێعری باش بۆی نالوێ، هاوکات لە ئاو ئاوردا بێ. لە هاوین و زستاندا بێ. هاوکات لە تەوەری باکوور و لە هێڵی راستی زەویدا (خگ استوا) بێ.

ئەسڵی بێلاینی شێعر لە سیاسەت لە شێعرا بە هیچ شێوەیەک بە رێوە ناچێ، چونکە شێعر بۆی ناکرێ وەکوو پۆلیسی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ناوچەی بێ لایەندا بمێنێتەوە.

قەسیدەی مەزن بۆی ناکرێ هاوکات لە نێوانی مان و نەماندا بێ.

شێعرێکم بە زەیندا نایە لە نێوانی چەند شتاندا جێگیر بێ، یان یان لە ناوچەیەکی چەک کراودا بێ. واتە ئەو شوێنەی نە شەڕکەری لێبێ نە چەک و نە سەرکەوتن و نە تێشکان.

شێعرێک بە خاياڵمدا نایە کە لایەنگری لایەنێ نەبێ، هەڵوێست نەگرێ و بۆ شتێک شەڕ نەکا.و شمشێرەکەی بۆ لابردنی ستەم و زۆرداری لە سەر مرۆڤ بەرز نەکاتەوە.

من دژی شێعری کورسم بە هەموو شكڵ و نموونەکانییەوە.

دژی شێعرێکم کە پەزگەڵ بۆ رەزامەندیی شوانەکەیانی دەنووسن.

دژی هەموو ئەو شاعیرانەم کە بەردەوام مووچەی مانگانەیان لە خەزێنەی "سیف الدولە" یان لە خەزێنەی "باب عالی" وەردەگرن.

هەر وەها لە ئەدەبدا دژی سیرکی (مدرانو)میرزا:، واتە ئەوە جێیەی کەویژەوانان فیلە سەما دەکەن. خرتوومیان بەرەو دیواری حاکم درێژ دەکەن تا مۆزێک، سێوێک، کولێریەک کە بە ئاوی سەرشۆڕی تەڕ کرابێ، بخۆن یان کاتژمێرێکی ئومێگا وەرگرن.

ئێمە شێعرێکمان دەوێ کە کۆتایی بە سەرپەرەشتی سەرمایە بە سەر وشەدا بێنێ و پێش بە دەس تێوەردانی پتر و دوڵار بۆ کڕینی ویژدانی (الخلیل بن احمد الفراهیدی) و پێشکەش کردنی کەوشی ئیتالیایی بە ژنەکەی و شریتی ویدیۆ کاسیت بە منداڵەکانی بگرێ.

پێویستمان بە شاعیرێکە لە بەر دەمی خەلیفە دانەنەوێ بەڵام خەلیفە خۆی لە بەر دەمی شێعرەکەی خوار کاتەوە.

**نزار قەبانی، تۆ کێی؟**

شوێنی لە دایک بوونم:

لە ژێر دارێکی یاسەمین لە دایک بووم کە گوڵ و گوڵێلکی سپیی بە سەر ماڵێکی کەونی دیمشقی لە نێوان گەڕەکی (الشاغور) و گەڕەکی ( ماژنە الشحم )دا دەشەکایەوە.

شایەتەکانی کاتی لە دایک بوونم:

پۆلێک کۆتر و پەرەسێلکە و پشیلە شامی کە لە 21ی مارسی 1923 نیشتە جێی ماڵی ئێمە بوون.
ئەوانە دەیانخوارد و دەیانخواردەوە، دەنووستن و زۆر بڵەییان دەرکرد. جووت دەبوون و لە ژێر چاوەدێری بنەماڵەی قەبانیدا وچەیان لێدەکەوتەوە.
بێچووە پشیلەکان لە ماڵە دیمشقیەکەماندا ، منداڵی ئێمە بوون. دایکم شیری خۆی دەدانێ و لە گەڵ ئێمە حەمامی پێدەکردن و لە گەڵ ئێمە دەیناردنە قوتابخانە.
رەگی چاو:
رەنگی ئاسمانی دیمشق لە کاتی هاویندا.
پیشە:
ئاشق.
حالەتی کۆمەڵایەتی:
ئاشق.
پلەی خوێندەوای:
ڵیسانسی ئەویندارى.
نیشانی تایبەتی :
دڵبریندار بە تیری شێعر .
شوێنی نیشتە جێی داییمی:
بە سەر هەورێکەوە لە نێوان کەنداو و دەریادا لە سەفەر دایە. دەترسێ لە ئەرد نزیک بێتەوە نەکا بە تاوانی منداڵی یان راست وێژیی بیگرن.
پێشینەی دادپەروەری:
بە تاوانی نووسین و بڵاو کردنەوەی سێ کتێب لە ئەوین و خۆشەویستیدا لە لایەن هەموو دادگا عەرەبییەکانەوە پاشملە مەحکوم کراوە. ئەم کتێبە لە لایەن داد ئەستێنی گشتییەوە "مدعی العموم" بە دژی هێمنی دەوڵەت لە قەلەم دراون.چونکە دەوڵەتە عەرەبییەکان لە ئەوین دەترسن، چونکە هاتوو چوو تێک دەچێ. قاوەخانە و باخە گشتییەکان پڕ دەبن لە ئەویندارانن. کیسەی نامەبەران بە نامەی ئاسقانە دەئاخندرێن. تەلەفون لە بەر دەنگی بەسۆزی ئەویندارن وەبەر ناکەون.بازرگانی گوڵە باخ و ئەنگوستیلە پەرە دەگرێ. دەشتو دەر پڕ دەبن لە سونبول. ژنی دووگیان زاینگەکان پڕ دەکەن و دیوانی شێعر لە کتێبخانەکاندا زۆر دەبن.
دەوڵەت بەوانە نەشەی نابزوێ و شاد نابێ و هەست بۆیان نابزوێ.چونکە ئەو لە بنەرەتەوە قەیرە کچە.مێرد ناکا و جیا لە خوَی کەسی خۆش ناوێ.

من کێم؟

بۆ ئەوەی پاشە کەوتی وەختم بۆ کردبن و زەحمەتی دارشتنی پرسیارانتان لە سەر لابەم پێتان دەڵێم منی شاعیر لە چلەکانەوە لە گەڵ خۆی بڕیاری داوە زمان لە پیتی یەکەمەوە تا دوایین هالچ داگیرسێنێ و گڕ و تین لە دەریا ڕا تا دەریا بخاتە نیشتمانەوە.
نەخشەی چ شتێکم پێ سەیر نەبووە دەستم تێوەرداوە.
رووخساری ئەبوو جەهلم پێ سەیر نەبووە.دەستم لەویش وەرداوە.
کێش و قافییەی شێعری عەرەبیش بۆ من سەیر نەبووە.بەربەرکانیم لە گەڵ کردوو.لاقەکانم لە کەوشە تەنگەکەی حەساندووەتەوە.
دەمەوێ شێعرێک بنووسم هەر ئیمزای منی پێوە بێ نە ئیمزای دە هەزار شاعیری دیکە کە بە عەرەبی، فەرەنسی، ئینگلیزی، تورکیی، ئیسپانیایی و چینی دەنووسن. ویستوومە شێعر هەر بە حیسابی تایبەتی

خۆم بنووسم، بێ ئەوە لە میراتی بنەماڵە ئەو سامانەی لە کتێبی ( الأغانی ) و ( العقد الفرید ) و بانکی (الخلیل کوری محمد الفرهیدی ) دایە قروشێک دەرکێشم.

18

**من کێم؟**

من ئەو شاعیرەم کە بەردەوام بە دوای پیتی بیست و نوهەم لە پیتەکانی ئەبجەدیدا دەگەڕێ .
دەمەوێ رەهەندێک بۆ ئاو لێدەم. بۆ ئەو نقیسانە کە لە بەر زۆریی ئاوخورەوە ئیشک بوون.
دەمەوێ دارێک، مانگێک و باخێکی مێوە و دار خورما و کەلامێکی خۆشەویستی بئافرینم کە ئەگر پیاوان بیبیسن دەمانچەیان لێ نەکێشن. ئەگەر ژنان بیخوێننەوە، شیر لە مەمکیان وەکوو رووباری زێڕ وەرێ دەکەوێ.
پیتی بیست و نۆهەم ئەو گەنجینە ئەفسونکارەیە کە هەزاران شاعیر لە سوێی دیتنەوەی مردن و پێی نەگەیشتن و هەزارانیش بە ئاواتی دیتنەوەی سەر دەنێنەوە.
لەوانەیە پیتی بیست و نۆهەم ببێ یان نەبێ. لە وانەیە راست بێ یان درۆ. لەوانەیە وەکوو بەردی فیلۆسوفان ( گوگردی سوور) لە باری بیچم و داڕشتن و زەینییەوە رێک و لوس بێ. بەڵام سەرەڕای هەر تشتێ شاعیری راستەقینە بوونی ئەو پیتە بە خەون و خەیاڵ دانانێ و درێژە بە پشکنین و دیتنەوەی دەدا. بیست و هەشت پیتی ئەبجەد شوێنەورای دۆزراوەن و لە هەموو کتێبخانە و ئەنتیکە خانەیەک و نوێنگەی خەتدا خراونەتە بەر چاو، چونکە ئەوانە سامانی سەقامگرتوو و مەڵی گیراون.
بەڵام شاعیر بەردەام چاوی لە دووی ئەو مەلانە وێلە کە نەیگرتوون، نە ئەو مەلانەی گرتوونی.
ئەگەر خەڵکی ئاسایی چۆلەکەیەکی گیراویان لە پەنجا چۆلەکەی بە سەر دارەوە پێ باشترە . شاعیران ددان بەو مەنتیقەدا نانێن و چۆلەکە نەگیراوەکانیان لەو هەموو ئەو مەلانەی لە بازاری مەل فرۆشاندا دەیانفرۆشن پێ باشترن.
شاعیر فرۆشیاری ئەنگوستیلەی ئەفسونکارە .
شاعیر فرۆشیاری فەرامۆشی پشووکەوتوویە.
شاعیر نە جل و بەرگی کۆن دەفرۆشێ نە رۆژنامە کۆن و نە شتی ئاسایی هەر لە بەر ئەوەیە کە شاعیر بەردەوام بە دژی مێژوو تاوانبار دەکرێن. بە حاشا لێکەری بنەماڵە، بڵاو کردنی ماڵ و سامان، تێک دانی زمان، دردونگ کردنی خەڵک لەو شتانە کە بایخدارن، لادان لە شێوەی سەقامگرتوو و راستە رێی تاوانبار دەکرێن.
ئەگەر رێگەی راست، هێڵێکی ئەندازیاری تەواو و لە سەر نەخشەی ئیدەئاڵی و دینیی و خوو و خدەیی بی. ئەوە لە سەر نەخشەی داهێنەرانە راست نییە. نە موسیقا، نە شێعر، نە پەیکەر سازی، نە نیگارکێشان، نە هونەری داستان نووسین، نە هەڵپەڕکێ، نە شانۆگەری لە توانایاندا نییە,لە ژێر سێبەری مل دانەواندن و کڕنۆش بردن و ملی رێگەی راست گرتن شێعر لە بە هێزی سەر بزێوی و دژایەتی و بەربەرەکانێ ئەو لە گەڵ دەستووری هاتووچۆ دایە.

**من کێم؟**

ئەز هەڵبەستڤانێکی خەباتکارم.
شاعیر ئەگەر کەسی دەس نەکەوێ لە گەڵ پەڕە کتێبان دەکەوێتە ململانێ و مشت ومڕ.
لە گەڵ کردار، بکەر، بەرکار، تا "تانیپ" و نوونی "نسوە" دەکەوێتە گێر و کێشە.
تەنانەت کە گراوییەکەشم هەوڵی دابێ بە پرچە رەشە درێژەکانی رێگەی هەناسە و پشوودانم بگرێ. بە دژی رنگی رەش چوومەتە خۆپیشاندان. من ناتوانم نە لە مەڕ ژن و نە لە مەڕ نیشتمان بێدەنگ بم.
بۆ ئەوەی بتوانم بنووسم دەبێ تا ئەو پەڕی بێزاریی بێزار بم. تا ئەو پەڕی بوێریی بوێر بم و وەکوو پڵێنگی ئەفریقایی دەمار گرژ بم.
من ناتوانم ببمە کۆتری نامەبەر، ببمە گیا بۆ جوانی و زینەتی نێو ماڵیان ببمە ماسی ناو "ئەکواریۆم"

هەزار جار پێم باشترە کوسە ماسی بم لە دەریای سووردا نە وەک ساردین بم لە نێو قتوودا کە بە زەیتون و لیموَوە دەخورێ.
تۆ بڵێی ئەم دژایەتییە لە سرووشتی شێعردا بێ؟
لە بنەڕەت ڕا : نا.
بەڵام شاعیری عەرەب هەر لە سەردەمی منداڵییەوە تا ئەو کاتەی دەمرێ پەڕ و پۆ قرژە، دەنگ گرە، وەکو کەلەشێرێک کەبە زۆر لە جێیەک ڕاگیرابێ و ناچار بێ شەو و ڕۆژ لە خۆی و مریشکەکانی پارێزگاری بکا.
هەروەها کوا بۆ شاعیری عەرەب دەلوێ. لە گەڵ ڕاستییەکەی ڕابێ؟
چۆن دەکرێ زاری شاعیری عەرەب بە مۆمی سوور مۆر بکرێ؟
چۆن بۆی دەلوێ بە متمانە و لە سەرخۆییەوە پێ بزانێ و ئاگادار بێ کە بازرگانانی پەلەوەر لە دەور و بەری ئەو خەریکی بردنە سەرێی بەها و قیمەتی پەڕ و پۆ و باڵەکانی و دەنگی خۆش و هێز وی خەنجەری بن؟
چۆن بۆی دەلوێ شاهیدی ئەو خۆ قڕ کردنە بە کۆمەڵەی عەرەب بێ و نەگری و هاوار نەکا، ڕەخنە نەگرێ، یان لە قاتی نەوت و نۆڕا خۆی هەڵنەدێرێ؟ چۆن بۆی دەلوێ لە ڕیزی خۆش و ڕابوێراندا وەمینێ، گوڵقەند بخوا، توکوولەکە بترووکێنێ، شەربەتی لێبەسەڕوەنێ و بڵێسەی ئاگریش شانۆ و شانۆگەران بسووتێنێ؟
شاعیر کوا دەتوانێ پاک و بێگەرد و ناسکولە و ژیر بێ و ئەوەی لە دەور و بەریشێتی شانۆیەکی نە ژیرانە بێ.
لە بەر ئەوە شاعیری عەرەب بە ڕاستی دەرەتانی هەڵبژاردنی کەمە. لە بەر ئەوە زمان لە دەستی ئەودا یان دەبێتە بومبای کاتیی یان کەوشە کۆنێک.
*

من کێم؟
من شاعیرێکی خەباتگێڕم.
شاعیر ئەگەر کەسی دەس نەکەوێ دژایەتی بکا لە گەڵ گەڵای کاغەز بە شەڕ دێ. لە گەڵ فەرمان، بکەر، بەرکار و فەرمانی (کان–بوو) و تای مێینە و نونی نسوەدا دەکەوێتە مشت و مڕ.تەنانەت کاتێ گراوییەکەم ویستوویەتی بە قژی درێژی هەناسەم ببڕێ... بە دژی ڕنگی ڕەش چوومەتە خۆپیشاندان.
من ناتوانم سەبارەت بە ژن و نیشتمان بێدەنگ بم.
بۆ ئەوەی بتوانم بنووسم دەبێ تا ئەو پەڕی بێزاریی بێزار بم. دەبێ هەموو وجوودم پڕ بێ لە ورە و دەمارەکانم وەکوو پڵێنگی ئەفریقی نیگەران بێ .
من ناتوانم کۆتری نامەبەر بم، یان گیای بۆ نێو ماڵ بم بۆ جوانی یان ماسی بم لە "ئەکواریۆم"دا.
پێم باشترە کە ببمە کوسە ماسی لە دەریای سووردا نە ماسی ساردین کە بە زەیتون و لیموَوە دەخورێ.
تۆ بڵێی ئەم دژایەتییە لە سرووشتی شێعردا بێ؟
لە بنەڕەت ڕا : نا.
بەڵام شاعیری عەرەب لەو کاتەوە لە دایک دەبێ تا کاتی مەرگی دەبێ تووکی لێ قرژ بێ، دەنگی گڕ بێ وەکوو کەلەشێرێک بێ کە بە زۆر لە شوێنێک ڕایانگرتووە و شەو و ڕۆژ دەبێ بۆ پاراستنی خۆی و مامرەکانیئامادە بێ.
لە بەر ئەوە چۆن شاعیری عەرەب دەتوانێ لە گەڵ ڕاستەقینەکەی لە ئاشتیدا بژی؟

چۆن بۆ شاعیری عەرەب دەلوێ و دەکرێ زاری بە شەمی سوور مۆر بکرێ؟

**چۆن دەتوانێ شاعیری عەرەب هەست بە ئاسایش بکا کاتێ کە دەبینێ مەل فرۆشانی دورووبەری لە سەر قیمەتی پەڕ و باڵی دەدوێن... باسی دەنگ خۆشییەکەی و هێزی گەروی دەکەن.**

**چۆن شاعیری عەرەب دەتوانێ شاهیدی ئەو خۆ کوژییەی کردنە بە کۆمەڵەی عەرەب بێ و نەگری و هاوار نەکا، بەر هەڵستی نەکا، یان خۆی لە پلەی77ەوە فڕێ نەدا.؟**
**چۆن بۆی دەکرێ لە ریزی گەشتوەرانیدا بێ و گەنمە شامی برژاو بخوا، تووی لێ بقرتێنێ و ساردی لێبەسەرِوەنێ و گڕی ئاگری شانۆ و شانۆگەری تێکەوە پێچێ؟**
**شاعیر چۆن دەتوانێ دوورە پەرێز بێ و نەرم و ژیر بێ و ئەوەی دەیبینێ لە دەروروو بەری نەژیرانە بێ.**
**لە بەر ئەوە شاعیری عەرەب دەرفەتی هەڵبژاردنی بە راستی کەمە. لە بەر ئەوە زمان لە دەستی ئەودا یان دەبێتە بومبای کاتدار یان دەبێتە جڵ و بەرگی کەون..**
*

**من کێم؟**
**ئەز شاعیرێکم وەکوو نێزە لە چاخی عەرەب چەقیوم.**
**لە خوێنی دینم، ئەویش زامدارام دەکا.**
**دەمەوێ هەواکەی بگۆڕم، ئەویش هەوڵ دەدا دەنگم بگۆڕێ.**
**من دەمەوێ رووڕەشی بکەم، ئەویش هەوڵ دەدا قوڕگم دەربێنێ.**
**من دەمەوێ بەرهەڵستی بکەم، ئەو لە هەولّی ئەوەدایە بەرتیلم بداتێ.**
**من پیاوێکم لە خەو هەڵدەستێ، دەنوێ، دەنووسێ و لە سەردەمی رووخانی دەوڵەتی هەباسییەکانەوە تا ئەمرۆ بە دیار برینی کەونی عەربانەوەیە.**
**جیاوازی من و کەسانی دیکە لەوە دایە کە من متمانەم بە پزیشکی عەرەب نییە، هەروەها متمانەم بە سیحری عەرەبیش نییە.**
**رێگەش بە خۆم نادەم دوور لە ئودەی نژدار وەمێنی و قاوەی لێبەسەرەوە نێ و جغارەی لێ بەباکا و دۆعاش بۆ تەمەن درێژی نەخۆش بکا.**
**غەریزەی هاوار کردن بەهێزترین غەریزەی منە.**
**هەر لە بەر ئەوەشە خۆم لە گەڵ کابارەچییە سیاسییەکانی عەرب، لۆتی و تەپڵکوت، زۆرناژەن، حەشیشی، جەنەوەر و گەوادەکانی عەرەب لە گێرە و کێشەدا دەبینم.واتە ئەو کەسانەی بە رۆژ بە سلامەتی گەڵی عەرەب و مەزنیەتییەکەی دەخۆنەوە و بە شەویش خوێنەکەی هەڵدەقوڕێنن.**
**لە گەڵ َئەو کەسانەی کە بە ئاشکرا و لە پیادەرێی نیشتمانی عەرەبدا زینای سیاسی دەکەن، هەروەها لە گەڵ ئەو سیرکە مەزنەی کە بوونەوەرە راهێندراوەکانی بەو جۆرەی سمۆرە توێکڵی گوێز دەقرتێنێ بێوچان ئێسکی گەڵی عەرەب دەکروژن، خۆم لە بەربەرەکانێ و گێرە و کێشەدا دەبینم.**
**تا ئەو کاتەی ئەو کابارە سیاسییانە دادەخرێن و راهێنەر و فێرکاری فیڵ و لۆتی و ئەو مەیموونانە خۆ لە کار دەکێشنەوە، پێویستی و ئەرکی شێعرە ئەم نیاری و نیاری نامەیە شەرمەزار بکا. هەروەها خراپی کاری دەرهێنەر و درۆی یاریکەران ریسوا بکا، تا لەو شانۆ و شانۆگەرییە دەس هەڵگرن.**
**ئەز ئا ئەو بوارە نالەبارە و لەو هەوا ناسازگارە و لەو دەریا بێ لەنگەرگەیەدا سەفەر دەکەم و دەنووسم.**
**لەو رێگەیەدا تاقمێک لە شاعیر و نووسەرەکانی عەرەب کۆتاییان بە سەفەرەکانیان هێناوە و گەڕانەوە.**
**بەڵام بۆ من وادیارە سووڕان و گێژ و خول خواردن بە نێو دەریادا چارەنووسمە و شەڕ بە دژی دایناسۆرەکان بەشێ لە مێژووی منە.**
**لە راستیدا شێعری من هەوڵ و تێکۆشانە بۆ شکاندنی هێزی کێشەری زەوی و میغناتیسی نەزانیی عەرەب.**

مەلە و سوبایی بە دژی هێزی کێشەری زەوی کارێکی ماندووهێنەرە، هەروەها دەرچوون لە ناوچەی ژێردەسەڵاتی تایفەگەری و بۆچوون و عادەت و باوەڕ و قەناعەتیان کارێکی گرانە، بەڵام لە خوێندنەوەی مێژووی عەرەب و جیهان دەردەکەوێ کە عەرەبی مەزن بەردەوام لە شەهید بوون نزیک بووە.

22

نزار قەبانی بۆچی دژ کاری؟

هەر دژایەتییە مرۆڤ لە بەرداش هەڵداوێرێ. دژایەتییە کە دەماری مرۆڤ لە هێڵی ئاسنی شەمەنەفەر جیا دەکاتەوە.

هەروەها ناڵوێ کە هێلەکانی شەمەنەفەر تێک بئاڵقین و یەکتر ببڕن. ئەو هێڵانە بەردەوام پاڵایان لێداوەتەوە، رازین، بە ئەدەوە ملاس بوون و چاوەڕوانی قەتارێکن کە دێ و بە سەریاندا بڕوا.

بەڵام شاعیر چاوەڕوانی کەس نییە.

ئەو قەتارەی دێ و ئەوەی نایە بۆ ئەو گرینگ نییە.

ئەو بەندرگەیەی دیارە و ئەوەی دیار نییە بۆ ئەو گرینگ نییە.

ئەو ویستگەیەی ناوی هەیە و ئەوەی بێ ناوە بۆ ئەو گرینگ نییە.

وا دیارە دەنگی من بۆ ئێوە دەنگی نەیاری و دژ کارییە.

کێ بە ئێوەی وتووە من شریتی تۆمار کراوم.

من کۆمەلێک دەنگی لە نێو خۆدام، وەکوو دەنگی هەناسەکێشانی باخ.وەکوو دەنگی زرینگانەوەی زەنگۆلە، وەکوو دەنگی چرژان و شکانی تەبەقی شوشە یان هاواری هۆزە سەرەکییەکان.

هەموو ئەو دەنگانە دەنگی منن، بە نەزم و بەرزیانەوە، بە خۆش و ناخۆشیانەوە بە ژیاریی و نەژیارییانەوە، بە پەسن کراو و نەکراوەیانەوە بە ساخ و بریندارییانەوە.

دەنگی شاعیر هێڵی چێکراوی‌سەر قەواروک نین کە هەر کاتێ لێدرێ هەر ئەو دەنگەی لێ بێ کە لە سەری تۆمار کراوە. دەنگی شاعیر هەموو شەپۆلەکانی ژیانی کۆمەڵ و مێژووی تێدایە، دەنگی شاعیر کەرەسەیەکی مووسیقای ئەوتۆیە کە دەیان کلیلی هەیە.

لە بەر چی نەیار و دژ کارم؟

چونکە تا ئێستا نە کونترۆڵچی بووم لە دایرەی کارەبادا و نە پشکنەری رەسمیی بووم لە دایرەی سەر ژمێریدا.

لە بەر ئەوە شێعرەکانم جارێک لە بیچمی گولە باخ دان و جارێک تەرح و شکڵی برینی کراوەیان هەیە. لە بەر ئەوە تکاتان لێدەکەم هەوا گۆڕین و گۆڕانکاریم لێ قەبووڵ بکەن. چونکە من کۆمەلێک تەقەمەنیتان بە شکڵی شێعر پێشکەش دەکەم.من دووخشتەکییەکاتان پێشکەش ناکەم کە دوو لەتەکە لە هەمبەر یەکتردا بن.

ئەوە کورتەیک بوو لە ناسنامەی کەسایەتی من کەسێک بیەوێ لە سەر من نهێنی زیاتری دەس کەوێ، ناهومێد دەبێ چونکە من کراوەم و وەکوو لەپی دەست وام، نە توانای خۆنواندنم هەیە و نە توانانی قاچاخچێتی.

من هەرگیز لە گەڵ قەسیدەی نهێنی رانەهاتووم، چاپخانەی نهێنیشم بۆ چاپی پەرە و پووڵی قەڵب یان بە هەلە بردنی بیر و فیکر نییە.

من وەکوو ئاسمانی دەریایی سپی وام ، هەر بەو جۆرە شێعر دەلێم کە لە هەوای ئازاد دا حەز لێکردوویی دەکەم.

لە بەر ئەوەی لە وڵاتەکەی ئێمەدا ئەویندارى لە بنەڕەتەوە بە نهێنییە و لەو رووەوە کە شێخی قەبیلە لە ژێر شەویلکەی راستیدا شەش ژن دەشارێتەوە و لە ژێر شەویلکەی چەپیشدا شەشی دیکەش. لە راستیدا شێخی هۆز منی بە تاوانی دژایەتی ( سامانی تایبەتی خۆی ) مەحکووم کردووە. هەروەها تاوانباری کردووم کە لە بەڵگەنامە و پسوولەی نهێنیدا ناوی ئەو ژنانەم بڵاو کردوونەوە کە لە یەخچالەکەیدا

رایگرتوون بۆ ئەوە لە کاتی خۆیدا بنێردرێن بۆ دیوەخانی ڕەسمیی چێشت خواردن یان بۆ خەوتنگەی حکومەت.

**کۆماری شێعر**

من دامەزرێنەری یەکەم کۆماری شێعرم. زۆربەی دانیشتوانی ئەم کۆمارە ژنن. ویزا وەرگرتنی ئەم کۆمارە هیچ مەرج و شەرتێکی نییە.چەمەدان و کیفی سەفەری کەس ناپشکێنرێ و داوای گەواهیی لەش ساخی لە نەخۆشی پەرەگر و فیکری پەرەگر لە کەس ناکرێ.

ئەم کۆمارەی من جیا لە جمهوورییەکانی دیکەیە. لەم کۆمارەدا شێعر سامانی گشتییە، وەکوو ئاو، هەوا و باخی گشتی.

لەم کۆمارەدا جیاوازی چینایەتی رەگەزی و فەرهەنگی نایەتە ناس کردن. دژی هەر چەشنە هەڵاواردنی شێعریم.

دژی ئەوەم شێعر ترۆ بکرێ و بە تەنیا لە حەوش و حەساری مێژووییدا بمێنێتەوە، دژی ئەوەم شێعر بکرێتە ناوەندێکی داخراو وەکوو ناوەندی بریج و ناوەندی رووتان.

دانیشتوانی ئەم کۆمارە بۆ گیر و گرفتی ئاو لە عازاودا نین، هەروەها بۆ کارەبا و هاتووچوو، بۆ شەوی شێعر و وەدەس خستنی شوێنی دانیشتن، پەرەی بلیت نادەن. دانیشتوانی ئەم کۆمارە بە کراسی هاوینی و بە قەلە دەرپێکەوە دەچنە شەوی شێعر و لە گەڵ یەکتر لە سەر ئەرد دادەنیشن، دەخۆن جغارە دەکێشن و پەرێن دەکەن.

بێکات و وادە دەچنە بارەگای شێعر و ناچار نین بە سەعات لە نەبودا بمێننەوە. لە کۆمارەکەی مندا خەڵک هەست بە نامۆیی و بیانی بوون لە شێعر ناکەن چونکە شێعر بووەتە سرووشتی دووهەمی ئەوان و ئەوانیش بوونەتە شێعر .

کۆمارە شێعریەکەی من کۆمارێکی هەڤبەشییە.

ئەو هەڤبەشییە نە تیۆریکە نە نومایشیی و نە درووشمە.بەڵکوو بە کردەوە هەڤبەشییە. کۆمارێکی ئەوتۆیە کە لە کۆمەڵگای ئێستای عەرەبدا زەوی بە یەکسانی بە سەر هەموو دانیشتوانیدا دابەش دەکرێ هەر هاونیشتمانییەک بی پەرە و بە رادەی پێویست شێعر وەردەگرێ.

ئەز خەو و خەیاڵتان پێ نافرۆشم.

ئەو خەیاڵانەی چل ساڵ لەمەوبەری من کە بۆ ئێوە هەڵەوەرێ و هەڵیت و پڵیتی حەشیشییەکان و زرەخەیاڵی شاعیر بوون.لە سەر ئەرد قەوامرە و شکڵی خۆیان بە خۆوە گرت و وەکوو پڕۆژەی دار چەقاندن و شیرین کردنی ئاوی دەریا بەرێوە چوون.

ئایا ئێوەش پێتان وانییە گرینگیی شیرین کردنی ئاوی شێعر لە شیرین کردنی ئاوی دەریان کەمتر نییە؟

هەڤبەشی شێعریی پایەی فیکری منە.

میللی کردنی شێعر ئەو ئامانجەیە کە لە یەکەم دەرەتاندا کە دەسەڵات بگرمە دەست بەرێوەی دەبەم.

یەکەم کارم ئەوە دەبێ کە لە هەموو گەڕەکەکان بنکەی هەرەوەزیی شێعر دادەمەرزێنم. بۆ ئەوە خەڵک دەستیان بە دیوانی شێعر بگا هەر بەو جۆرە کە شوشەی شیریان دەس دەکەوێ.

من دژی حەشار دانی شێعرم چ شا بیکا و چ خەلیفە. فەرقیان نییە.. یان ساڵۆنەکان بیکەن. یان ئەم دەس بەسەرداگرتنە لە لایەن دەسەڵاتەوە یان ( انتلیجنس)ەوە بێ.

من باوەڕم بە ساڵۆنە ئەدەبییەکان و ئەو ریزانەی کە بۆ وەزیر و ژنەکانیان تەرخان دەکرێن نین.

من بە ئەزمونی خۆم بەو ئاکامە گەیشتووم کە ئەوانەی لە ریزەکانی بەرەوەدا رودەنیشن ئاخر کەسەن کە چێژەی شێعر دەکەن و ئەو کەسانەی کە ریزەکانی پشتەوە دادەنیشن بۆ خۆیان بە تەواوی شێعرن.

شێعربارانە و بە یەکسانی بە سەر پاریس، ژنیو، سانفەرانسیسکۆ، دورگەی کاپریدا دەبارێ. هەر بەو جۆرەی کە بە سەر چوار قوڕنەی خاڵی، بنگلادیش، گەڕەکی "غوریە" و "سقامین"دا دەبارێ.

شێعر ئەو پاسپۆرتەیە کە هەموو شاعیرانی جیهان بە شێوەی ئۆتوماتیکی خوا لە بەرزاییەکانی هیمالیا لە دایک بووین خوا لە تاشکەند یان تانزانیا یان مەککەوە ڕێدەگرن.
شێعر پاسپۆرتێکی یەکسانە بۆ هەموو شاعیرانی جیهان.
هەر هەولێک بۆ پێوە لکاندنی شێعر بە ڕەگەز، ئایین، هۆز، پشت و وەچە و دابەش کردنی جوگرافیایی یان پێوەندییەکانی کۆمەڵایەتی ئابوورییەوە ڕەنگێکە لە لە ڕەنگەکانی جیاوازی دانانی ڕەگەزایەتی کە لە گەڵ یەکسانی و هەمووانیی بوونی شێعر یەکتر ناگرنەوە.
دیارە ئەوە بەو مانایە نییە کە شاعیری ئینگلیزیی بە جەوهەری چینی بنووسێ یان شاعیری عەرەب جینزی ئەمریکی لە بەر بکا و شاعیری ئەفریقی دەس لە تەپڵ و ڕمبەکەی و قەناعەتی جوانی ئەفریقایی هەڵگرێ، یان شاعیری ئیسپانیایی واز لە خەمی ئەندولێسی و لە گیتاری فرمێسک ڕژێنی بێنێ.
ئەوەی من بیزانم ئەوەیە کە ماکی شێعر وەکوو ماکی ئاو یان وەکوو ماک و جەوهەری ئاگرە، بەڵام ئەوەی جیای دەکاتەوە ئەو شکڵ و بیچمەیە کە ئاو بە خۆیەوە دەگرێ و ئەو ڕێگایە کە ئاور ڕووناکی دەکا.
لە یەک ووتە دا خوێنی هەموو شاعیرانی جیهان یەکە ، بەڵام ئەوەی کە خوێنی "متنبی" لە خوێنی "پابلونیروادا" یان "ئیلۆار" ، "مایاکوفسکی" جیا دەکاتەوە گرووپی خوێنە، نە خوێنەکە .
هەموو شاعیرانی جیهان کۆمەلە رووبارێکن، هەرکام بزووتنی خۆی هەیە، ئاهەنگی خۆی هەیە سەرچاوەی تایبەتیی خۆی هەیە، بەڵام هەموویان رووگەیەکیان هەیە بۆ ئەوە بگەنە یەک دەریا، ئەویش دەریای مرۆڤایەتییە.
ئەویش ئەو ئامانجە مەزنەیە کە دەنگی ویتمان وەکو دەنگی ابن الفارچ و دەنگی معری وەکوو دەنگی اقبال و دەنگی شریف الراچ وەکوو دەنگی عمر خیام و دەنگی بودلیر وەکوو دەنگی ابو نواس دادەنێ.
ئەم شاعیرانە سەرەڕای جیاوازیی دەنگەکانیان، زمان و سەرچاوەی فەرهەنگییان وێکڕا و پێکەوە سەمفونییەکی مەزن پێک دێنن وە هەموو سەردەمەکان گوێ بۆ ئەو سەمفونییە رادەگرن .

25

نزار قەبانی ! بۆ دەنووسی ؟
بۆیە دەنووسم چونکە شێوەیەکی باشترم بۆ خۆکوشتن بۆ نادۆزرێتەوە .
چونکە ناتوانم خوێنم بکەمە ڕوویی تەماتە .
بەو تێڕادیوی و خاتر جەمییەوە دەنوسم کە سنبوڵ باڵا دەکا، دەریا دەهاژێ وە مەمک پڕ لە شیر دەبێ.
ئەگەر لە مەمکی ژن بپرسی بۆچی تەژیی شیرە، داخوا وەڵامت دەداتەوە ؟ بۆیە دەنووسم رووبەری شادی لە جیهان دا بەرینتر و رووبەری خەمیش بەرتەسک بێ.
دەنووسم بۆ ئەوە هەوای جیهان بگۆڕم، ڕۆژ بە سۆزتر بکەم، ئاسمان شین تر و خوێی دەریا کەمتر کەم .
دەنووسم تا لە گەڵ جیهان جووت بەست بم .
هەتا زیاد بکەم :
تا وەچەم لێ بکەوێتەوە .
تا ببمە سەت و پەنجا ملیۆن نزار قەببانی .
ئەوە پرۆژەی ئاواتەکانی منە و پێم قبووڵ ناکرێ لە کۆمارە شعرییەکەی من هاووڵاتییەک کەم بێتەوە .
چونکە ئەگەر یەکێک لە منداڵەکانی من ئێوارەیەک نەیەتەوە، خەم دام دەگرێ و تەواوی شەو چاوەڕووانی هاتنەوەی دەکەم، چونکە ناتووانم بە تەنیا نان بخوَم و لە گەڵ شێعر دانیشم .
من بڕیارم داوە لەگەڵ جیهان بزەوجم .
شاعیری وا هەیە کە جووت بوون و زەوجێنی لەگەڵ ئەم جیهانە بەشێوەی شەرعیە.
شاعیری ئەوتۆش هەن کە جووت بەست بوونیان بەشێوەی مەدەنییە .

شاعیری واهەن کە یەکگرتنیان بەشێوەی عورفییە .
شاعیری ئەوتۆ هەن کە بە نامە لە گەڵ جیهان جووت دەبن.لە بەر ئەوە ئەوانە وەچەیان لێ ناکەوێتەوە.
هێندێک شاعیری دیکە هەن لە گەڵ خۆیان دەنوون و دڵیان بۆ ئەوە نابزوێ لە جنسی دیکە نزیک (خەڵک) ببنەوە.
بەڵام منی شاعیری شرووشتیخوو بڕیاری داوە لە گەڵ نیشتمانی عەرەب جووت بێ و هەزاران شێعر و زاروکی لێ بکەوێتەوە.
بۆ دەنووسم؟
لە بەر ئەوە یەکێک لە ئارەزووەکانم ئەوەیە کە جوغرافیای نیشتمانی عەرەب بە ووشە بگۆڕم ئەوەش کاتی زۆر و ئارەقی فرە و فرمێسکی پڕ ئاوی گەرەکە.
بەڵام خالێکی شێعر لێرە،
خالێکی دیکەی لەوێ،
تۆفان دەخاتە رێ.
26
نزار قەبانی بۆ کێ دەنووسێ؟
خۆم ناشکێنم و دەڵێم بۆ رۆحی خۆم دەنووسم یان بۆ بنەماڵەکەم، یان بۆ منداڵانی گەڕەکەکەمان.
لە زەینمدا پرۆژەی شێعر دادەرێژم و لێی پاشگەز نابمەوە.
ئەوەی شێعرم رووی تێدەکا هەموو دارێکە ، یان هەورە یان ماسییە یان پشیلەیە یان ئەستێرەیەیان کۆترە کێوییە لە نیشتمانی عەربدا .
تا ئەو کاتەی لەو نیشتمانەدا گوڵە گەنمێک هەبێ کە بە زەحمەت لە شێعر بگا لە مەزرایە دەچمە لای و بەر لەوە بنوێ شێعری بۆ دەخوێنمەوە.
تا ئەو کاتەی لە شەقامەکانی نیشتمانەکەمدا پشیلەیەک هەبێ و شێعری لە لا گرنگ نەبێ، لە ئامێزی دەگرم و تووکی بە شانە دەکەم، دەیلاوێنمەوە، بادام و پستەی دەدەمێ و شێعری خۆشەویستی بە گوێیدا دەچرپێنم تا هەستی مێینەی دەبزوێنم.
تا ئەو کاتەی قوتابییەک لە قوتابخانەکانی عەرەب دا هەبێ لە شێعری سەردەمی نەزانیی بێترسێنن و بۆ ئەوەی سزای بدەن چەند نموونەی ناقوڵای رەق و تەقی پێ لەبەرکەنن من ترسی دەرەوێنم و فرمێسکەکانی بۆ دەسڕم و دەیکەمە هەڤاڵی خۆم و هاورێی شێعر .
تا ئەو کاتەی یەک هاونیشتمانی عەرب هەبێ و نەتوانێ ببێتە شەوی شێعری من و هۆیەکەی گیر و گرفتی هاتووچو و یان نەبوونی پەرە یان کرێی ئوتوبوس بێ، دەچم بە شان هەڵیدەگرم، چونکە من ناتوانم بە بێ ئەو دەس بە خوێندنەوەی شێعرەکەم بکەم و بێ ئەویش ناتوانم کۆتایی پێ بێنم.
چاوی خەڵک ئاوێنەن و من روخساری خۆمیان تێدا دەبینم.
خەڵک قیبلە نومای منە و جێی من لە زەمان و مەکاندا نیشانم دەدا.
کاتێ شێعرێک بە تۆ دەڵێ ئەو پێوەندیی بە جیهانی دەرەوە نییە و هەر بۆ خۆی دەنووسێ و بەوە سەرخۆشە کە لە گەڵ خۆی دەدوێ، مانای ئەوەیە کە ئەو هەر حەز لە خۆی دەکاو خۆی بە عادەتێکی نهێنییەوە خەریک دەکاجاری وا هەیە نووسەر حەزی لە کەسێکی دیکە نییە هەر ئەوەندەی بەسە دەس بە لەشی خۆیدا بێنێ و دەس بە سەر پەڕەی کاغەزدا بساوێ .
ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەو شاعیرە لە باری شێعرییەوە لادەرە .
لە راستیدا شێعر لە پلەی یەکەمدا هونەری دەس پێدا هێنانە، واتە دەساژۆکردنی کەسانی دیکەیە.
بە بێ دەساژۆ کردنی کەسانی دیکە ناتوانین سنوور و کەوشەنی لەشی خۆمان و دووریی فیکری خۆمان بدۆزینەوە.
زانست بە مرۆڤەوە دەست پێدەکاو بەوەوە کۆتایی دێ.

*

شێعر سەفەرە بۆ نێو خۆ و دەروونی مرۆڤ.

شاعیر ئەو ڕێبوارە هەر هەبووەیە لە دەروونی مرۆڤدا.

ئەو شاعیرانەی لە هونەری پێوەندی گرتن لە گەڵ خەڵک بە گشتای شارەزا نین، لە جەژن و کۆڕی شایی و خۆشیدا بە تەنیا دەمێننەوە.ئەوانە لە گەڵ قاپی ویسکی دەدوێن تا چرایان بە سەردا دەکوژێتەوە.

ئەو شاعیرانەی ناتوانن لە مێرو، مێشەهەنگ، دار و ئوتوبوس بگەن. گەڵی عەرەب بەوە تاوانیار دەکەن کە ئەو گەلە کۆمەڵێک ساویلکە و نەفامە و تێنەگەیشتوو و نەخوێندەوارە.

ئەو گەلە پێویستی بە شێعری ئەو هەستیارە هەیە و بیست هەزار ساڵی نووری چاوەڕوانی گەڵی عەرەب بم تا لێم تێبگا و لێی تێبگەم.

کەسیش نازانێ داخوا پاش بیست هەزار ساڵ شێعر لە کتێباندا دەخوێننەوە ، یان لە دەرمانخانە وەکوو حەب وەری دەگرن. واتە هەر بەو جۆرەی کە ئاسمان گەڕەکان لە سەفەرەکانی خۆیان و لە پاپۆرە ئاسمانییەکان دا هەڵیداوێن. من تامەزرۆم ببمە شاعیری ئەو کاتە، ئەو دەمە، ئەو ڕۆژە، ئەو مانگە، ئەو سەردەمە و ئەو زەمانە. بەڵام ئەو زەمانەی کە شکڵ و تەرحەکەی ناناسم، هەرگیز فیکری لێناکەمەوە.

من باوەڕم بەو خەڵکە عەرەبە هەیە ، بە سپی و ڕەشییەوە بە باش و نەباشییەوە بە زانا و نەزانییەوە.

ئەم خەڵکە عەرەبە چارەنوسی دیاری کراوی منە بە نێو چاوان و توێڵ و قامکەکانمەوە.

هەرگیز نەمتوانیوە سەد و پەنجا مێلیون عەرەب لە قاپێلکەی سەرم وەدەرنێم و لە جیاتی ئەو خەڵکی سویس و وڵاتانی ئیسکاندیناوی تێڕێژم.من لە دادێشدا لە گەڵ گروپی خوێنەکەم دەمێنمەوە ە شێعرەکانیشم پێوەندییان بەو منداڵدانەوە هەر دەمێنێ کە تێیدا گووراوە و پەروەردە بووە.

27

بۆ کێ دەنووسم؟

لە نووسیندا لەو هاوبەشانە دەدوێم کە بە شێوەیەکی دادگەرانی شادی و خەم، ژیری و شێتی، ڕۆژی تاوساو و بارانیی، سۆز و پرینگانەوە، هەوای بەهاری و گەرمای هێلی نێوە ڕاستم لە گەڵ بەش بکەن.

لە سەر هەموو منداڵانی جیهان دەنووسم بە شێت و ئانارشیستەکانییەوە، واتە ئەو کەسانەی کە لە نزمترین پلەی بێ تاوانی و پاکی دان . بۆ هەموو قوتابیانی ڕاکردوو لە گرتووخانەکانی ڕاهێنان و فێر کردنی عوسمانی و "انشکاری" دەنوسم کە بۆ سارای ئازادی ڕایان کردووە .

بۆ ئەوانە دەنووسم کە لە ڕادەبەدەر بەهەستن و ڕزگاری خوَیان لە شێعر دا دەبینن و لە سەر شانی شێعر خەویان لێدەکەوێ، هەر بەو جوَرەی کە ماسی پاش ململانێ زۆر لەگەڵ شێتەکانی دەریا لە قەراخی دەریا ڕادەزێ.

لەنووسین دا لە هەموو ئەو ژنە تێژراوانە دەدوێم کە وەکوو ماسیی ساردین لە کتێبەکانی عاد و پمود دان .

سێدارە دراوەکانی بەر دەروازەی شارەکانی عەرەب دەدوێم ، بو ئەو لێوانە دەنووسم کە ناتوانن بپەیڤن و من

لێیان دەدوێم بوَ ئەو چاوانە دەنووسم کە ناتوانن بگرین و من لێیانەوە دەگریم .

کاتێکیش کە دەنووسم لە زمانێک دەگەرێم کە ببێتە داوەرێکی هاوبەش لە نێوان من و تورەمە و لە وچەی عەرەب دا کە نایناسم و ملێونان هزر کە هەرگیز رێکنەکەوتن ، بەڵام بێگومان لە دادیدا لەگەڵ شێعر و شۆڕش خۆ رێک دەخەن .

28

بۆ کێ دەنووسم ؟

بێگومان نووسین بۆ هەموو بنەماڵەی مرۆڤە .
بۆ خۆشیی ، بەختەوەری و پێشکەوتنی مرۆڤە . نووسین بە بێ ئەو رووانگەیە دەبێتە یارییەکی وەستایانە ، خەیاڵ و زێدەکاریدوورەپەرێزانەی مێشک و دەست ، وەکو کاری سێحربازان و یارییەکانی سیرک .
هەموو نووسەرێک لە بنەرەت را دژی خراپەیە .ئەرکی سەرەکیی ئەو ئەوەیە هەموو ئەو رەفتار و شێوەکارانەی کە جیهان تووشی ترس و ستەم و دزیویی دەکا مەحکووم بکا .
لە بەر ئەوە بە پێی هزر ،مەنتیق و ئەخلاق بۆ نووسەر دژوارە ببێتە لایەنگری کووژەر دژی کووژراو ، لایەنگری لە ستەمکار بکا دژی ستەم لێکراو ، یاریدەدەری خەنجێر بێ دژی گۆشتی مرۆڤ. لایەنگری فاشیست بێ دژی ئازادی لایەنگری تەناف بێ دژی مل و هاوکاری شەیتان بێ دژی خودا .
لە جیهانێکی وەکوو ئەو جیهانەی ئێمە کە بە سەر دەریای پڕ لە بانگ و هاواری زۆرکاری و ستەم و تاوان و کوشت وبڕ و کاری رەگەزپەرەستانە و پۆلیسیی دا وەکو مەست بە لادا دێ، لە جیهانێکی وەکوو ئەم جیهانەی ئێمە کە مرۆڤ بە هۆی شەڕی ئابووری و عەسکەری و وێرانکارانە دەبێتە سیسرکێکی شێت ، لە توانای نووسەردانییە بە قاپێک ویسکییەوە دەرگا لە سەر خۆی گاڵە بدا و بێلایەنی خۆی لە نێوان دەریا و کەشتیدا ، لە نێوان ددانی کوسە ماسیی و گۆشتی ریونگەکان دا رابگەیەنێ.
29
نزار قەببانی ! تۆ چ کارێکت کردووە ؟
من شاعیرێکم و هەوڵ دەدەم بە قامووسێک کە ووشەکانی لە هەزار تێناپەڕن ، ئم جیهانە هەراو ئاواڵە بکەمەوە .
من نە چەکدارم هەیە ، نە رەوە ئەسپ و سوارکار ، نە تیشکی لایزێر ، نە راکێتی قارەپێو نە فرۆکە هەڵگر و نە رادار .
بەڵام دڵم رادارێکی وردبین و بەهەستە کە هەموو هێما و ئیشارەتێکی مروَڤ وەردەگرێ .
زۆری لەسەر نارۆم و گرێو تەگەرە ناخەمە کارتانەوە ،چونکە ئێمە بۆ خوَمان گریمانەی مێژوویی کەونمان لە ئامار دا هەیە و ئەوەندەشە کە هە تا رۆژی پەسڵان بەشمان دەکا و پێویست نییە گرێ پووچکەی شێعریشی لێ زیاد بکرێ جانتای فیزو و خۆ بە زڵ زانیی خۆم لە بەر دەمی ئێوە ناکەمەوە .
مژتۆکی قڵیان لە گەرووم راناکەم و بە زاراوەی حەدیس لە گەڵتان ناپەیڤم تا پێتان بسەلمێنم کەمن رۆشنبیرم .
دیارە رۆشنبیری لە گەڵ ساکاریی لێکدانەوەو ئاخافتن دژایەتی نییە .
ساکاری مانای نزمیی و شیتووکەیی ، رووالّەتی و نەخوێندەواریی نییە .
تۆ دەتوانی و بۆت هەیە هاوکات ساکار بی جوانیش بی .
ئەو کەسانەی شێعرو چیرۆک و فیلم و شانۆ نامە بۆ زاروَکان دەنووسن ، دەزانن نووسینی ساکارانە بە زمانی منداڵان چەندە دژوارە.
من شاعیرێکی ساکارو سادە نووسم .
بە هەموو هێزمەوە دەلێم ساکاریی و سادە نووسین سەر چاوەی هێزی منە .
لە ساڵی 1944 ەوە خەریکم شێعری عەرەبی بکەمە قووماشێکی میللی کە هەموو لە بەری کەن، وەکوو دەریای لێ بکەم خەڵکی بچنە قەراخی . لەوکارەشدا سەرکەوتووم .
لە ساڵی 1944 ە وە سوێندم خواردووە کەسێک لە نیشتمانی عەرەبدا نەهێڵم کە شێعری پێ ناخۆش بێ . بێدزێوی و فشاری خوێنی بەرز کاتەوە ، یان لە گوێدان بە شێعر یان خوێندنەوەی شێعر رابکا و لەو کارەشدا سەرکەوتووم .لە ساڵی 1944ەوە خەننم بەوەوە دیوە کە بە شێعر وڵاتانی عەرەب داگیر بکەم ئەوە ئێستا داگیرم کردوون .

**لە 1944ەوە وەکوو مێرو خەریکی کێشەوەم . پیت و وشە بە پشتم کیشەوە دەکم ، بۆ ئەوە لە شێعر زمانێکی دیموکراتی دروست بکەم ، بۆ ئەوە لە قاوە خانە لەگەڵ خەڵک دانیشێ و چاییان لەگەڵ بخواتەوە و سیغاریان لەگەڵ بە باکا .**

**دیارە بەرزە فری من ناگاتە ئەو رادەیە کە خۆم رانێم و بلێم ،من زمانێکم داهێناوە ، چونکە زمان کەروێشک نییە کە لە کڵاوی سیحرباز بێتە دەرێ .**

**بەڵام رێگە بە خۆم دەدەم و دەلێم ئەو زمانەی کە خەڵک پێی دئاخفی دە کارم کردووە و بڵاوم کردووەتەوە. بەڵام ئەوان لە بەکار هێنانی دەترسان.**

**زمانی شێعر لەمەوبەر لە بەر زان بوو. دەست وێی رانەدەگەیشت. بروکراتیی و پروتوکولیی بوو .لەگەڵ خەڵک تۆقەی نەدەکرد مەگەر بە دەستەوانەی سپییەوە .بۆ لای کەس نەدەچوو مەگەر بەکڵاوی لەنگەریی و شالگەردەنی بۆرەوە .**

**لە کوورتی بیبرِمەوە ، دیواری نێوان خۆم و "زمانی عەرەب"م رووخاند .**

**رازیم کرد ئەو کۆشکە چۆڵ کراوەی باوکی کە لە رووحی مردووان جمەی دێ، بە جێ بێڵی ، بچێتە لای قوتابیانی قوتابخانە ، کاربەدەست ، کرێکار ، دووکاندار، تیمارکەری نەخۆش و لیخورِی ماشینە کرێ و لە گەڵیان تێکەڵ بی .**

**زمانی عەرەب بەوە لە بایەخی کەم نەبووەتەوە . ئەوە زمانێکی جووانە ، نە شەبزوێنە و دەو لەمەندییەکەی بێسنوورە .**

**بەڵام ئەو زمانە پێویستی بە گۆرِینی هەوا هەیە . هەروەها پێویستە دەرگاکان بکرێنەوە ، فەرش و مافوورەکان راتڵە کێندرێن و شووشەکان خاوێن بکرێنەوە . چوونکە زمان وەکوو رووەک و مرۆڤ پێویستیی بە ئوکسیژێنە ، دەنا بەگازی ئۆکسیدی کەربۆن دەخینکێ .**

**لەم جیهانەدا زمانێک نییە گەورە نەبێ، چوکە نەبێتەوە، درێژ نەبێ، قوڵە نەبێتەوە، ئاوس نەبێ و نەزێ و وەچەی لێنەکەوێتەوە.مەگەر ئەوە کە ئەو زمانە کان بێ یان لە بەرد بێ.**

**بە رپرسایەتی گۆرینی هەوای زمان ، دارژتنەوەی و دابەش کردنەوەی شتوومەک و کەرەسەکەی دەکەوێتە سەر ئەستوی شاعیرەکان . چونکە ئەوان بە حوکمی سروشتی شێعر لە پێشترن و سەربەشییەکی تایبەتییان هەیە، لە تاوانەکانیان چاوپۆشی کراوە هەڵەکانیان بە هەڵکەوتن، سەربزێوییەکانیان شیاوی لێبوردنن چونکە ئەوان وەکوو منداڵی بەناز بەخێوکراوی بنەماڵەی عەرەبن.**

**شاعیر منداڵی تاقانەی کۆمەڵگای عەرەبە کە رێگەی پێدەدرێ یاری بە زمان بکا ئەگەر شاعیر "هەمزەی"لە سەر تەختی بەرزی خۆی بەرەوژێر شۆرِ کردەوە، یان کەزییەکانی"تأ تانیپ"ی کورت کردنەوە، یان لە بیری چوو سوورە گولێک بۆ "نون نسوە" بنێرێ، حوکمی خنکاندنی لە لایەن دەستوور و یاساکانی هۆزەوە نادرێ. بەو حیسابە کە ئەو پاسپۆرتێکی سیاسی لە گیرفان دایە و تێیدا نووسراوە " شاعیر ئەو مافەی هەیە کە نە شاعیر نییەتی ". بەو پێیە ئەو شاعیرەی کە لە سەربەش و مافە تایبەتییە سیاسییەکەی خۆی کەڵک وەرناگرێ. بۆ ئەوە دیواری زمان شەق بکا وا دادەندرێ لە دوو هونەران "هونەری شێعر و هونەری دیپلۆماسی"دا سەرکەوتوو نەبووە.**

30

**لە مەرِ گیر و گرفتی زمان ئێژی چە؟**

**زمان بە تەواوی منی داگیرکردووە لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی داوم، تا ئەو رادەیە کە جیهان بۆ من شکڵ و بیچمی خاڵ و مەودایە.**

**گوڵ زمانە، ئەستێرە زمانە، دار زمانە، روخساری ژن زمانە، لەشی ژن زمانە، پێکەنینەکەی زمانە، خرِیی مەمکی زمانە، مەل زمانە، فرمێسکی منداڵ زمانە، رووەمەتی پشمەرگە زمانە، ئەمانە هەموو زمانن و هەوڵ دەدەم پەردە لە سەر راز و نهێنییەکانیان لادەم.**

**ئێمە توانای فام کردن و تێگەیشتنی ئەم جیهانەمان نابێ مەگەر زمانێکی هاوبەشمان هەبێ.**

واهەیە مرۆڤ توانای فام کردن و تێگەیشتنی نییە. تەنانەت لەو شوێنەی لە سەری دادەنیشێ یان لەو کراسەی لە بەری دەکا تووڕەیە و لەو نەی کە حەزی لێدەکا حاڵی نییە.
هۆی هەر رووداوێک پسانی پردی زمانە لە نێوان ئێمە و ئەو شتانەدا.
هۆی هەموو ناتەباییەکانی ئەم جیهانە لە بنەرەتەوە لە ناتەبایی زمانەکانەوە سەرچاوە دەگرن.
کاتێ پێوەندی نێوان شێعر و خوێنەر دەپسێ مانای ئەوەیە بۆشاییەک لە زماندا سەری هەڵداوە.کاتێ خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد هەرەس دێنێ مانای ئەوەیە ئەو دووە ئیتر لە زمانی یەکتر ناگەن .
دەکرێ راز و نهێنییەکی مەزنتان لەلا بدرکێنم.
ئەو رازە مەزنەش ئەوەیە کە بە زمان ژنم دەس کەوتووە و بە زمانیش لێم تۆراوە، دامەزراندنی بناخەی پێوەندییەکی گەرم و بەتین لە گەڵ ژن لە ئارادا نابێ مەگەر ووت و وێژ تێیدا دەوری سەرەکی هەبێ.
*
ئایا وشە بە شێعریی و نە شێعریی دابەش دەکرێ؟
من بڕوام بەو جۆرە دابەش کردنانە نییە.
وشەکان هەموو کیژۆڵەی ماڵیکن.وشە وەکوو جل و بەرگ وان لە بەر ئێمەدا نەبن شکڵی پێویست بە خۆیانەوە ناگرن.
هیچ وشەیەک لە وشەیەکی دیکە بەڕێزتر نییە. مەگەر بە هێزی خۆی بکەوێتە بەر دڵمان و بە تینی خۆی و بە تەواوی و بەراستیی ئەزمونی ئێمە رابگەیەنێ.مەزنناییەتی بنەماڵەیی و سەرپشکییەکەی لە زماندا جێ ناگرێ.
بە بڕوای من وشەکان هەموو کیژی مێرد نەکردوون. تا ئەو کاتەی لە گەڵ نووسەر دەنوون سەرنجام کە لە پەردە دەرکەوتن یان رووسوورن یان بە روو زەردی و خەوشداری دێنەدەر.
لەو حالەتەدا بەرپرس نووسەرە، وشەکان بەرپرس نین و ئەوان هەمیشە بێ تاوانن تا ئەو کاتەی شاعیر لە گەڵیان تێکەڵ دەبێ. ئینجا وشەکان لە ژێر دەستی ئەودا یان دەبنە کچە پاشایان دەبنە کچە کڵفەت و قەرەواش.

31

دارشتن و قەوارە گرتنی زمان لە لای تۆ چۆنە و لە چ مەڵبەندیڕا دێ؟
زمانی من پاژێک لە ئەوینی منە.مانای ئەوەیە هەر ئەوینێکی تازە کە گیرۆدەی دەبم زمانێکی نوێم لە گەڵ خۆی بۆ دێنێ.
زمان بارستایی ئەوینی ئێمە دادەگرێ. ئەگەر ئەوینەکەمان مەزن بێ، ئەوە زمانەکەش مەزن دەبێ. ئەگەریش خۆشەویستییەکە بەرتەسک بێ زمانەکەش بەرتەسک دەبێ.
شێعرەکانم هاوکات لە گەڵ خۆشەویستیم لە دایک دەبن هەر وەکوو برووسکە و گرمەی هەور کە وێکرا لە دایک دەبن.
کاتێ ئەوین هێرشم بۆ دێنێ و من گیرۆدەی دەبم زەمانێکم بۆ هەڵبژاردنی تاکەکانی شێعرم نامێنێ.
لەو کاتەدا بیر لە هیچ شتێ ناکەمەوە و پلان و پرۆژە بۆ هیچ شتێک داناڕێژم. لە تاقیکاری ئەویندا بەشداری دەکەم بێ ئەوە دەرزەکانم بە باشی لە بەر کردبن. هۆی سەرکەوتنەکەشم هەر ئەوەیە . ئەوانەی دەرزەکانیان بە کۆڵی دڵیانەوە بێ لە تاقیکاری دەرناچن.
ئەو ئەویندارانەی زیاتر بیر لە زمانەکەیان دەکەنەوە تا خۆشەویستەکانیان ئەوین و گراوییەکانیان وێکرا دەدوڕێنن.
بۆ لێنەگەڕین و رێگە نەدەین، زمانی ئەوین ساکار و سرووشتی بێ؟ بۆ دەبێ دیواری تێئۆری و ئیدیۆلۆژی و گریمانەی رۆشنبیرانەی بەسەردا بڕوخێنین؟
ئەویندار عەرەب بە حوکمی شوێنی لە دایک بوون و گەورە بوونی پڕگریمانەیە ئەگەر وایە بۆ چی ئێمە گرێ و گۆلێکی دیکەش بەو گریمانە مێژووییە بلکێنین و لێی زیاد بکەین.

**ئەویندارى عەرەب بە درێژایی مێژوو سریالیی و رەمزیی و چوارسووچی "وەکوو ئەویندارى فیلمی سینەمایی و یاریگەرانی شانۆ و ..." نەبووە. ئەویندارى عەرەب لە گەڵ گراوییەکەی بە شێوەیەک دەدوێ کە "لە گەڵ حاڵ چۆنیەتییەکە داری بکەوێ."واتە هەر بەو جۆرەی کە لە زانستی "بلاغت" واتە لە عیلمی جوانی وتە و کەلامدا گوتراوە.**

**ئەوینی عەرەب روونە، بریقەدارە، رەڵمیە، وەکوو رۆژ پڕ تریفە و وەکوو نووکی خەنجێر و دەمی کێرد وایە.**

**ئەگەر وایە بۆچی ئێمە زمانی خۆشەویستی لە وڵاتی ئیسکیمویان یان ئیسکاتلەندرا بێنین؟**

**ئەوینی عەرەب ئەوینێکی هێرشی و بۆرکانییە. هەموو ئەو شتانە بە شقارتە، فوسفور و باروت دان، تێی دایە.ئەگەر وایە بۆچی ئێمە ئەو ئەوینە لە سەهۆڵاندا رابگرین. زمانی ئەوینی عەرەب لە چاو زمانەکانی دیکە جوانترە و لە بەرامبەر زمانی ئەوینی دیکەدا لە سەرترە، بریسکەدار ترە و دینامیکییە.**

**ئەوەش راستە لەو زمانەدا برووکەیەک سەرەتایی بوون. زۆرکاری و توند و تیژی، نێریتی و لە بنەوە برَیی تێدایە و جاروباریش سادیستییە. بەڵام ئەو دژی ئەو نییە. چونکە لەودا برووکەیەک تینی رەڵمی ئێمە و گڕی خۆرەتاو و شنەشنی بای پەنجاکانی نێوخۆی ئێمەی تێدایە.**

**هەموو زمانێک لە قەوارەی خۆیدا هەوا و سرووشتی ئەو مرۆڤەی پێی ئەئاخفێ بە خۆیەوە رکێش دەکا . ئاهەنگی زمانەکەش کاردانەوەی ئاهەنگەکانی دەرونیی گەلە.**

**تۆ شێعری خاوەن کیش و سەروات نووسیوە، تێیدا نوی کاریشت کردووە. هەروەها شێعری نوێت نووسیوە و پەخشانیشت تایبەتمەندیی خۆی هەیە. قەوارە دارژتن و شکڵ گرتنی قەسیدەی توَ چۆنە؟**

**هونەرمەند نازانێ بەر لە ئەزموون و تاقیکاری چ شتێکی نوَی دئافرینێ.**

**قەسیدە لە کاتی کاردا شکڵ دەگرێ یان هاوکات لە گەڵ کاردا شکڵ دەگرێ.**

**ئەوە تەنیا نەزم نووسەکانن دەزانن کە بۆ رۆژی 17ی (ژیالحجه) شێعر ێک بە شێوەی "بحر گویڵ" بە بۆنەی دامەزراندنی بەردی بناغەی کارخانەی تفاقی مەر و ماڵاتەوە دەنووسنَ.**

**لە بەر ئەوە شکڵی شێعر هەر وا نە دیارە .وەکوو بێچووی گوَڕاوە لە منداڵدانی دایکی. مادام لە دایک نە بێ نێرو مێی نازانرێ.**

**لە پێوەندیی لە گەڵ شێعر دا من زۆر لە سەر شکڵ و قەوارە پێ داناگرم و چ حەسساسیەتێکم دژی قەسیدەی پەخشان یان هەر شکڵێکی شێعریی تازە نییە چونکە شکڵ و بیچم دەسکردی مرۆڤە، ئاڵ و گۆڕ و رێک و پێک کردنیشی هەر بەدەست ئەوە . ئەگەر پێویست بێ و هەڵ و مەرج رێگابدا، بۆی هەیە وەڵای بنێ. گرنگ بۆ من ئەوەیە ئەو دەقەی کە دەیخوێنمەوە بە دڵم بێ. ئەوە ئەو شێعرەیە کە من بە بێ پەروپۆکەی چاوەرووانی دەکەم و دەمەوێ .**

33

**شاعیر چۆن دەلێ خوێنەر دەرفێنێ ؟**

**بۆ ئەوە پەسنێکی عەرەبیی نییە کە شاعیر کەڵکی لێ وەرکرێ و شێعرەکەی پێ سەرنج راکێش و دڵڕفێن بکا و خوێنەر واقی وڕبمێنێ .**

**ووشەکان وەکوو مرۆڤن. بە شێکیان هی رابردوون. پاژێکیان هی دادێن. تاقمێکیان ژیرن. دەستەێکیان شێتن. برێکیان نەرم و هێندێکیان توند و خەستن. گرووپێکیان لە نهێنیی و قوَلێکیان لە ریسوایی دەدوێن. هێندێکیان هەڵدەپەرن. هەڵپەرینی بەشێکیان سیرکییە. هێندێکیان وەکوو قەتاری شەو دەخۆشین و بەشێکییان وەکوو فرۆکەی کونکورد ئاسمان دەسمن .**

**بۆ ئەوەی شێعر لانی کەم دڵڕفێن بێ پێویستە رێک و پێکی ریزی وشەی زمانی ئاسایی هەڵتەکێنێ، بە ناچار دەبێ بەردێک فرێ دەرێتە نێو چاڵ و بیری کەلامی ئاساییەوە.دەبێ شلەژان و پشێوییەک لە پیتی ئەبجەدیدا پێک بێ و پەڕەکانی رۆژنامە پرژ و بلاو بکرێنەوە.**

قەسیدە و شێعری جوان چاوەڕوانییەکی چاوەڕوان نەکراوە.
بە بێ ئەو هێمانە هاندەرە، شێعر دەبێتە میوانێکی بارگران کە هەموو شەوێک بۆ ئەوەی شێوەکەمان لە گەڵ بخوا لە کاتژمێر هەشتدا لێمان وەڕوور دەکەوێ.
شاعیری دڵڕفێنی وەکوو"ابەنواس، رامبو، بودلێر و متنبی" هەرگیز بۆ شێف ناکیەن.ئەگەریش بێن پاش چەند ساڵ و مانگ و دوای کۆکردنەوەی سفرەکە دێن.
ژن و شێعر وەکوو یەکنئەو ژنەی سۆز دەدا و نایە جوانترە لەو ژنەی بەلێن دەدا و دێ. ئەو شێعرەی بە خنکاویی لە دەریای ئەفسون و سەرسوڕماویی و واق وڕماندا بە جێم دێلێ، پێم گرینگترە لەو قەسیدەیەی دێ و کاتژمێرێکی سایکوی لە جومگەی دەستی کردووە.

34

نزار کەی وازت لە نووسین بە سەر دەچێ؟
کاتێ ئەنجام دانی کارێک لە ژێر دەسەڵاتی تۆدا نەبێ، وەکوو گەڕانی خوێن لە لەشدا، هەناسەکێشان، برسییەتی و تونیەتی، دیارە مرۆڤ لەوانەدا نە دەسەڵاتی هەیە و نە دەتوانێ بە ئەنقەست رایانگرێ.
مەیڵ بۆ نووسینیش یەکێک لەو ویستە ئاڵۆزانەیە کە نووسەر ناتوانێ لێوەپچڕێ. وەکوو سیغارکێش کە بیەوێ دەس لە سیغارکێشان هەڵگرێ. یان شەراوخۆر کە نەخواتەوە، هەروەها وەکوو پێوەندی گرتنە لە گەڵ ژن.
نووسین ئاڵ و گۆڕ بە سەر هەڤدووان (تەرکیب)ی خوێندا دێنێ.
گروپی خوێن دەکاتە گروپێکی کەم وێنە کە لەوانی دیکە ناکا.
ڕەنگی خوێنمان بە پێی ئەو ئەوینەی کە لەو خوێنە دایە دەگۆڕێ و دیکاتە بنەوشی ڕەنگ ،پرتەقاڵی ،زیرین ،یان وەکوو ڕەنگی گوڵاوی لێ دەکا .
هیچ شاعیرێک بۆی ناڵوێ چ لە باری شێعرییەوە و چ لە لایەنی پزیشکیی و راستە قانی یەوە هەڤدووانی خوێنی خوَی بگۆڕێ و بیکاتە ئاوی هەڵم وەکوو ئاوی "ئیڤان و ڤیشی ".
کاتێ خوێنم دەبێبە ئاو ناتوانم لە خوێن و لە شێعر م ئیجازە وەرگرم (ناتوانم شێعر نەنووسم )ناتوانم زارۆکی نووسین رازی بکەم کە لە ئودەکەی وە دەر کەوێ و لە شەقامدا یاری بکا .ناتوانم ترۆی بکەم و دووری بخەمەوە . چونکە من ناتوانم بە بێ بزووزیی و توند و تیژیی تیک دەرانەی ئەو بژیم .
لە بەر ئەوەیە کە دەبینی هەروا درێژە بەو کارە دەدەم . دەستم بە پەڕی کاغەزەوە گرتووە هەر وەکوو مندالێک کە بە چنگ مەمکی دایکی دەگرێ . کاتێ نووسەر لە خەبات و بەربەرەکانی دەکەوێ و دەستی بۆ ئەوە ناچێ خۆی بە پەڕی کاغەزەوە خەریک بکا ، مانای ئەوەیە کە ئەو نووسەرە کە وتوتە بەر"نەحلەتی نووسین " لەو کاتەوە ئیدی ئەو تڵپاتی تەڕی تێدا نەماوە ، کەڵکی بڕاوەوە و شتێکی لێ هەڵناوەرێ .
لە پێوەندیی لە گەڵ خۆم دا ، من هەر وەکوو پێشوو بۆ نووسین خورێنم . بیر لە پارێز و رێژیمێکی تایبەتیی ناکەمەوە کە مەیلی شێعر گوتنم رەق راگرێ و ئیشتیای حەزلێکردووییم نەهێلێ"قدیس یوحنا " ی پیرۆز دەڵێ : ئێمە هەموو لەسەرمانە خۆرێن بین . واتا کەسانێک بین کە بەکەم رازیی نابن منیش لە حیزبی یوحەننام . یان لە حیزبی ئەو کەسانەم کە بە کەم رازی نابن بە کەم رازیی بوون لە شێعر دا مانای چیە ؟
یانی گەدەت نێوە بێ . یان نێوە مەیلت هەبێ . سێ قامکت هەبێ و چوواریەکی دڵ .
وشەی بە کەم رازیی بوون لە زەین و مێشکی من دا وەکوو وشەی کەم خوێنی وایە .یان وەکوو پسوولەی کووپین کە دە سەعات لە سەرەدا رادەوەستێ بۆ ئەوە رانە مریشکێک دەس کەوێ .
لە شێعر دا دەستووری کۆپین وەرگرتن و قات و قریی و پشتوێن تووند کردن بە رێوە ناچێ .من یان مریشکێک وەر دەگرم یان خۆم دەخنکێنم .

کاتێ فیلمی "فوکی درندە"م دی، لەو ماسییە بەسامە بە هۆشە خۆرێنە کە دەریای بە پاپۆڕ و سەیرانگەر و بە گالۆنی بەتاڵی بەنزینیەوە و هەموو شتێکی رەنگ کەویی هەڵدەلووشی، سەرم سووڕما .
بۆ دەمێک ئارەزووم کرد ببمە ئەو ماسییە خورێنە کە ئیشتیا و مەیڵ و شارەزایییەکەی بێ سنوورە. لە مەڕ بە کەم راوی بوون هەموو پیاوان وەک نین. پیاوی وا هەیە بۆ رەزامەندی خودا بە کەم رازییە، هی وا هەیە بۆ رەزامەندی سەرۆکەکەی بە کەم رازییە، هی واش هەیە بۆ رەزامەندی ژنەکەی بە کەم رازییە، بەڵام شاعیر منداڵێکە و دەیەوێ هەموو شتێکی هەبێ. بۆی بلوێ یان بۆی بووز نەخوا. کاتێکیش ئەو شتانەی کە گڕنەی لێگرتوون کەوتنە بەر دەستی زۆر زوو لێیان دەبێزرێ و هێرش دەباتە سەر ئەو دورگە خەیاڵییانەی کە لەمەوبەر نەیدۆزیبوونەوە.
شاعیر ئەو قانعەیە کە بە کەم رازی نابێ.
شاعیر ئەو پرسیارەیە کە وەڵامی نییە.
گرینگی شاعیر لەوە دایە کە توانای خەم خواردن و دڵتەنگی و ئازاکێشانی بەردەوامی هەیە.

35

مەرجەکانی نوێ بوونی شێعر کامانەن؟
پێت وایە کرانەوەی دەلاقە و روانگە و رێبازی تازە بە تەنیا لەم سەردەمەدا بەسە بۆ ئەوە شاعیری مەزن بئافرینێ یان چارە نییە و دەبێ لە کۆتاییدا کەون بکوژرێ؟
– هەڵەیەکی مەزنە ئەگەر پێمان وابێ نوێ بۆ ئەوەی ببێتە نوێ، ناچارە و دەبێ کەتن بکا و کات و سەردەمی بەر لە خۆی بکوژێ.
فیکر و خەیاڵێکی ئەوتۆ مێژوو دەکاتە گۆڕستان یان دەیکاتە کوشتارگە و لە ئاخردا کەس رزگاری نابێ.
نوێ سەرەیەکی بە راستی دوور و درێژە لەو سەرەیەدا شاعیران لەو جێگایانەی کە مێژوو بۆیان دیاری دەکا رادەوەستن. هەروەها کەس ناتوانێ وەپێش ئەوی دیکە بکەوێ یان کەسێک جێگەی ئەوەی دیکە بگرێتەوە. چونکە مێژوو بە باشی چاوەدێری ئەو سەرەیە دەکا رێگە بە کەس نادا فێڵ و تەلەکە بکا.
شاعیری مەزن نە لە نەبوون ڕا دێ و نە بە هەڵکەوت. چونکە هەڵکەوت و ئیحتماڵ لە قومار دایە نە لە شێعر .
ئەوە شاعیر نییە بڕیار بدا کە ئەو مەزنە یان نوێیە یان بە نرخە.چونکە مەزنییەتی شاعیر و نوێ بوون یان بە نرخیی ئەو لە لایەن بیروڕای گشتییەوە دیاری دەکرێ و دادگایەکی گەلی حوکمی لە سەر دەدا کە بەرتیڵ وەرناگرێ و چەوساندنەوەی تێدا نییە.
ئەوە دادگای شێعری گەلە. هەر ئەوە دەتوانێ شاعیر بەرێتە ترۆپکی سەربەرزی یان لە گرتووخانەی توند بکا.
*

36

لە مەڕَ شێعری پەخشان بیروڕات چۆنە و بەو جۆرەی کە دەگوترێ ئەم شێوە نووسینە ریشەی لە مێراتی کەونی عەرب دایە. ئێستا و دادێ ئەم شێوەیە چۆن دەبینی؟
– شێعری پەخشان رێکەوندێکی نوێیە بۆ چەمکێکی کەون.ئەم قەسیدەیە کەونە و لەو کاتەوە مرۆڤ بیری کردۆتەوە هەیە. رستەیەکی تەنێ دەکرێ بە دەیان شێوە بگوترێ و دەیان ئیحتمالی هەبێ.
ئیحتمالەکانی کەلام و وتە بێبڕانەوەن. یەکیش لەوانە قەسیدەی پەخشانە کە ئێمە لەو کتێبە ئائیینیە پیرۆزەکاندا دەیانبینین. وەکوو سوورەی "مریم" و سوورەی "الرحمن" و سووره بچوکەکانی قورئان. هەروەها ئەوکوو ئەو سترانانەی کە بە کۆر دەوترێن و بە شمشاڵ و قەرەنەی لێدەدرێن.
من خۆم شێعری پەخشان لە میراتی خۆماندا وز لە نێو زمانی دینامیکیی عەرەبیش بە نەخۆیی و بیانی نازانم کە بە مێلیون ئیحتماڵی لێدەکەوێتەوە.

لە سەردەمی زێدەگاوی و و توند و تیژی و هەڵچونی لیبراڵیسمدا لە ئێش و ئازار و ئاڵ و گۆڕەکانیدا قەسیدەی پەخشان سەرهەڵدەدا. دەڵێی ئەوەش وەڵامێکی پڕ بە پێستە و بە جێیە بۆ ئەو سەردەمە ئەگەر بیەوێ بئاخفێ.
لە گەڵ هەموو ئەو ئاڵ و گۆڕ و بوومەلەرزەیەی ئەو چاخە کە لە فکری عەرەبدا ڕەنگ دەداتەوە چاوەڕوانم کە قەسیدەی پەخشان ببێتە شێعری دادێ چونکە ئەو شێعرە بە وەرەتر و ئازاترە.
37
ئاخافتنەکەت لە سەر قەسیدەی پەخشان هەموو وا لێدەکات کە دەرگای ئەو قەسیدەیە بکوتن، بە تایبەتی قوتابیانی قوتابخانە ناوەندییەکان، گەلۆ لەو فتوایەی دەیدەی لە دادێی شێعر ناترسێ؟
دادێی شێعری عەرەب دەکەوێتە بەربەرەکانییەکی گەورەوە و لە "قاوەخانەی تەوەزل و بێکارگەلی سوڵتان"دا رونانێشی...
هەر کارێکی مەزن لە بنەڕەتدا بێمەترسی نییە.
پێخەمبەری خۆ لە مەترسی هاویشتنە، شۆڕش پڕ مەترسییە، ئەوین و خۆشەویستی مەترسیدارە.
دۆزینەوەی ئەمریکا پڕ مەترسی بووە. دابەزینی مرۆڤ لە سەر رووبەری مانگ پڕمەترسی بووە. هەروەها نووسینی قەسیدەش بە شکڵی جۆراوجۆر لە هەمووان پڕ مەترسیترە.
ئەز لەوە ناترسم قەسیدە بە تەنیَ بچێتە شەوگەردی. لەوە دەترسم لە پشت دەرگای گاڵەدرا رونیشێ تا دەبێتە قەیرە کچێکی بێمێرد.
من دژی "زیندانی کردنی قەسیدەم" هەر بەو جۆرەی کە دژی "زیندانی کردنی ژن"م پێویستە ئازادی هاتوچوو بدرێ بە قەسیدە، چونکە تێرا کردنی ڵاقەکانیقەسیدە لە " کەوشی تەنگی چینی"" هەر بەو جۆرەی چینییەکان لە گەڵ لاقی کچەکانیان دیکەن شێواندنی پەسنی ژنێتی ژنە بۆ قەسیدەش هەر وایە.
لە ئازادیدا ترس نییە، بەڵام لە کۆیلەتیدا ترس هەیە.
هێندێک فیڵ و فەرەجی شێعری هەیە کە جار و بار دەردەکەوێ. ئەگەر تاقمێک شارڵاتان و قاڵتاغ و قومارباز وەکوو گیاکەلە لە ئەردی شین دەبن ئەوە نابێتە دەلیل و هۆ بۆ ئەوە مرۆڤ لە ئازادی دردونگ بێ و لێی وەشک بکەوێ یان لە بەرامبەر هەر ئاخافتن و کەلامێکی نوێدا حکومەت نیزامتی ڕاگەیەندرێ، چونکە حکومەت نیزامی لە ئەدەب و وێژەدا هەموو کاتێ زیانهێنەرە.
من ڕێگە بە خۆم نادەم و ناتوانم بە فەرمانێک قەسیدەی پەخشان بنەبڕاو بکەم، هەر لە بەر ئەوە کە نوێیە.غەریب و بێگانە و مێژووی ئەدەبی ئێمە نایناسێ.
مێژووی ئەدەبی ئێمە شانۆگە ریش ناناسێ ، سە رە رای  ئەوە کەس ناڵێ ئەو شانۆیەی ئێمە تماشای دەکەین غەریبەیە  لە میراتی ئەدەبیی ئێمەدا پیشینەی نییە ونزمە.
نیگارکێشان و پەیکەرسازی لە خەیاڵی عەرەبدا هەمیشە حەرام ولە بێدینییەوە نزیک بووە.
ئەمانە ئەمرءَ کفر نین و حە رامیش نین .
ئەی بۆچیئێمە قە سیدەی پە خشان لە و قانوونە دەرباوێین ؟
بوَی هەیە رەخنە لەسەر ناوە کەی بێ ، بەڵام ناولێنان کوا گرنگە؟
گرنگ ئەوەیە ، ئەویش بیچمێکە لە بیچمە کانی نووسین کە بڵاو بووەتەوە ونوسەر وخوێنەری خوَی هەیە .
زەوی کانگای تیپ تیپ گوڵ وگیایە. واهەیە کەس ناویان نەزانێ و لە شێوە و هەڵ و مەرجی پەروەردە بوونیان ئاگادار نەبی و لە تایبەتمەندییەکانیان شارەزا نەبی. لەگەڵ ئەوەش ئەردیش چ رەخنە و ئیرادی لە سەریان نییە.ئەگەر لێیان گەڕێن روو لە چارەنووس و ژیانی خۆیان دەکەن. ئەگەر بتوانن خۆ لە گەڵ ئاو هەوا رێک خەن دەمێننەوە و ژیان مافی خۆیانە.ئەگەریش رێک نەکەوتن دەمرن .
ئەز ناتوانم سەرکۆنەی قەسیدەی پەخشان بکەم ، هەر لە بەر ئەوە کە وێنەی لە ئەدەبی عەرەب دا نییە .

له راستی دا تئوری هاوتای و ویچوویی ، ئەدەب دەکاتە کارگەی نژنی و تەون کردن یان دەیکاتە کارگەی ترومبیل و کەلوپەلی نیومال و هەزاران کالا و شتی هاوتا دەداتە دەرەوە .داهینان چوونە دەر لە جەغزی هاوتاییە .
ناکریَ قەسیدەی عەرەب هەتا هەتایە وەکوو بەیاننامەکانی حکوومەت و بلاووکی بازرگانی لە دەزگای ستینسیل دەربکیشرین .
قەسیدەی پەخشان نایەویَ کۆپی بکریَ.لە بەر ئەوە ئەز ریزی بوَ دادەنیم .
زانستی من لە دادیَ قەسیدەی پەخشان لە گەل ئاواتی شۆرشگیرانەی مرۆڤی عەرەب ریک دەکەویَ . کاتیَ مرۆڤی عەرەب بەرە بەرە لە هەل و مەرجی کۆمەلایەتی ،سیاسی و ئابووری بیزار بوو ، شتیکی سرووشتیە لە هەل و مەرجی زمان ، لیک دانەوە شیوەش بیزار بیَ .
نووسین بە شیوەی "بحر گویل" مانای ئەوە نییە کە من لایەنگری قەومیەتی عەرەبم و نووسینی قەسیدەی پەخشان و ئازادیش ،بەو مانایە نییە کە من دژی قەومیەتی عەرەبم چی ها قەسیدەی بە کیش و سەروە هەبوون کە پیلانی راستەقینە بوون بۆ نیشتمان ، چی ها شیعری ئازادیش هەبوون کە قەدر و حورمەتیان بۆ نیشتمان گیراوەتەوە .
نەتەوە پەرەستیی راستەقینە نەتەوەگەریی چیَ کردن و داهینان .داهینەر نیشتمان پەروەری راستەقینەیە .
خەیان کەسیکە قەسیدەی بیمانا دەنوسیَ هەر چەند لەسەر
مەسەلەی فەلستینیش بیَ .

## موسیقای شیعر

موسیقای شیعر بەحرە لە پرایی و تەواوەتی خۆیدا . ئاوە بە گشتیی و لە تەواوەتی خۆیدا . کیشەکان هیمان بۆ تەرکیب و هەڤدودانینی ئاو . بەلام ئەوان تەواوەتی ئاو نین.
مووسیقای شیعر شتیکە مەزنتر لە کیش و بەحر و سەروا .
ئەوانەی پییان وایە زانستی " عروچ " بەریوەبەری ئۆرکیسترە کە نە ماندوو دەبیَ و نە خانەنشین و ریگا بە هیچکام لە مووسیقی زانەکان نادا جیابېنەوە و سەربەخۆ تیبکۆشن و ئاهەنگی خۆیان بگیرن یان لە ئاهەنگە بنەرتییەکە لادەن . ئەوانە دەیانەوی مووسیقایی شیعر عەرەب لە پلەی "ال دوم–تاک" واتە لە قۆناغی ئاهەنگی رۆژهەلاتی رابگرن.
هەر بەو جۆرەی کە هەزاران رستەی جوانی موسیقای هەیە و چاوەروانن یەکیک بیانلیَ، هەزاران رستەی شیعریش هەن کە چاوەروانن یەکیک بیاننوسیَ.
هەر بەو جۆرەی کە زانایانی شەریعەت لە شەرعدا مافی فتوادانیان هەیە شاعیریش مافیکی ئەوتۆیان هەیە.
بە بروای من شیعری نویش جیا لە کومەلیک فتوا تشتیکی دیکە نیە.
شیعری عەرەبم بە دەولەت کردووە رازاندوومەتەوە و لە مانەوە لە ژووری رستەی تاکە موسیقایی رزگارم کردووە.
شیعری ئازادیش بۆ خۆی فتوایەکە قەسیدەی " تفعیلیە دائریە" و قەسیدەی پەخشانیش فتوان، روا نییە ئەوان بە تاوانی خەیانەتی گەورە بخنکینین یان بەو دەلیلە کە بۆ قسەکان بەلگەیان نییە، یان وەکوو ئەوانە نییە کە لە کتیبی پیشینیاندا بوون.
بەرژەوەندی قەسیدەی عەرەب لەوەدایە کە دەرگای فتوا ئاوالە کاتەوە ، دەنا دەبیتە قەسیدەی فاشیستی یان قەسیدەی کولکە داری رەق و تەق.
کاتیَ شیعری شاعیریک دەخوینمەوە ئەوەندەی سەرنج نادەمیَ بزانم ئەو چ دەلیَ بەو رادەیەی کە سەرنجی دەدەمیَ تا بزانم شیعرەکەی " چۆن" دەلیَ. هەموو شاعیرانی جیهان وەکوو یەک هەست و حالەت دەیانگریَ، بەلام هەرکام لەوان شیوەی دەربرینی هەست و کارتیکردنی تایبەت بە خۆی هەیە.

سەنعەت و هونەری شێعر لە هەوەڵ ڕا تا ئاخر " شێوەی دەربڕین و نیشان دان"ە.
ئەو شاعیرانەی سەرنجی جیهانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشاوە ئەوانەن کە جیهانی دەروونی خۆیان بە شێوەیەکی تاک و بێوێنە دەربڕیوە و نیشانیان داوە.

39

ئەی سەبارەت بە کێش و سەروا "قافیە"دەڵێی چی؟ گەلۆ وەلانان و قرت کردنیان دەلوێ؟

بەردەوام سەروام بە چرا سوور شوپاندووەلە لێخوڕ کتوپڕ تووشی دەبێ و ناچارە لە خێرایی ترۆمبیلەکەی کەم بکاتەوە، یان بە یەکجاری بیوەستێنێ تا ئەو کاتەی کە هێزی پاڵپێوەنەری موتورەکە دەگاتە سەر خاڵی بۆش ، ئەوە لە کاتێ دایە کە موتورەکە وەفڕکە کەوتووە و لەو پەڕی ئاییسان و بەرەوپێشچون دایە.
بێگومان ئەو ڕاگرتنە کتوپڕە چاوەڕوان نەکراوە، کار دەکاتە بزوتن و حەرەکەی ترومبیلەکە و دەمارەکانی لێخوڕ و ساخێتی ڕێوەنگەکان.
ئەوەش بە مانای ئەوە نیە کە ئێمە داوای وەلانان و سەرنخونکردنەوەی قافیە دەکەین، بەڵکوو ئێمە پێمان وایە قافیە دانان هەڵویستێکی دڵخوازانەیە کەسێکیش بیەوێ لایەنگری لە بوونی سەروا و قافیە بکا، با بیکا. کەسێکیش بیەوێ لایەنگری لێ نەکا و لە دووی نەدا با لێی تێپەڕێ کەسیش لە بەر ئەوە ناخرێتە گرتووخانەوە.
گرنگ ئەوەیە لەو جێییەدا کە ئاهەنگەکە دەگۆڕدرێ و بۆشایی لە نەمان و قرت کردنی سەروادا هەڵدەدا جێگرێکی هەبێ. ئەگەر شاعیر لە توانایدا هەبێ ئەو جێنشینە بۆ ئاهەنگەکە پێشکەش بکا ئەوە ئێمە بە هەموو ڕێز و کڕنۆشەوە گوێی بۆ ڕادەگرین.
ئێمە خۆمان بە نمونە و وێنەی موسیقای مێژووییەوە هەڵنەسپاردووە.
دەنگوەر لە دەس شاعیر دایە.
هیچ مەرجێکی لە پێشدا دیاریکراویش بەسەر ئازادییەکەیدا نەسەپێندراوە.
ئەوەی ئیمە لێمان دەوێ ئەوەیە دڵنیامان بکا لەوەی کە بە جوانترین شێوە شێعرەکەی دەڵێ.
ئێمەش کارمان بەوە نییە کە ئەو بە چ شێوەیەک ئاهەنگەکەی دەگێڕێ.
مەل کەو دەخوێنێ چ دەربەستی نۆت و ئاهەنگە نووسراوە نییە و خۆی گیرۆدەی تاقە مەقام و دەزگایەکیش ناکا. خەنجەرەکەشی بە پێی هەل و مەرجی ژیان کێش هەڵدەگرێ.
ئەگەر وایە ئەی بۆچی ویست و دەسەڵاتی شاعیریش وەکوو هی مەل نەبێ؟

40

بە بڕوای تۆ مەترسییەک هەڕەشە لە شێعری نوێی عەرەب دەکا؟
ئەو مەترسییە مەزنەی کە هەڕەشە لە شێعری نوێی عەرەب دەکا هەرچی و پەرچێیەتی و شێتیگەری و بێنەزمییە.
شێعری نوێی لە بەر هاوتایی و وێچون و تێکەڵ پێکەڵیی دەنگەکان بووەتە پاپۆڕەکەی نووح.
من هەموو ئەو شێعرانەی کە دەکەونە بەردەستم دەیانخوێنمەوە بەڵام تا ئێستا من بە قەناعەتی تەواو نەگەیشتووم کە بڵێم ئەو شێعرە بۆ دامەزراندنی دادێی عەرەب پەسنکراو و دڵگرن.
شاعیرە نوێنووسەکانمان ویستیان شێعر لە هاوتایی و دوپاتکردنەوەی هێلە هاوتاکان ڕزگار بکەن کە چی بۆ خۆیان هەر لەو چاڵە کەوتن ئەوانیش لە ڕووی شێوە و شێواز و وشە و شێوەی وتنەوەی هاوتاکان. وەکوو بیست جمک و قڵن کە هەموو لە سکێک بەر بووبێتنەوە. کاتێ یەک لەوانت خوێندەوە ئیدی بەسە و پێویست ناکا ئەوانی دیکە بخوێنیەوە. هەر دەڵێی هەموو شێعرە نوێکان یەک یەک قەسیدەن و سەد شاعیری عەرەب ئیوزایان کردووە. وەکوو ئەو بەیاننامەی کە لە کۆتایی کونگرە و کۆبوونەوەکاندا وێژەوان و ئەدیبان ئیمزای دەکەن. ئەو ڕواڵەتە مەزنە تەنانەت بۆ شاعیری قەسیدەی

عمودیەش نەهاتوەتە پێش. لە حاڵێکدا شێعری هەر شاعیریک لەوانە تام و بۆن و چێژی خۆی و ئاهەنگی تایبەتی خۆی هەیە.
"متنبی" شاعیرێکی سەربەخۆ بوو."بحتری"یش هەروا. لە هیچ سەردەمێکی شێعریی عەرەبدا وانەبووە کە هەموو شاعیران یەک پێژامە لە بەر کەن، لە سەر یەک جێوبان بنوون و هەموویان بە دەفرێک ئاو بخۆنەوە هەر وەکوو ئەوەی کە ئەمڕۆ لەو شاعیرانەی ئێمەی رووی داوە.
مەترسییەکی مەزنتر ئەوەیە کە شێعر و قەسیدەی نوێ پێوەندی خۆی لە گەڵ ریشەی شێعری عەرەب بپسێنێ ببێتە منداڵێکی بی دای و باو.
برێ لە شاعیرە نوێنووسەکان بە ئاشکرا داوای سەرنخون کردنی رابردوو، بێقەدر و حورمەت کردنی شێعری عەرەب بە گشتی دەکەن و دەبێژن کە ئەم شێعرانە کومایەک تشتی بێکەڵک و لەت و کوت و بێبایەخن.
ئەوەش وتەیەکی خۆڕاییە چونکە نوێ بوون کودەتای نیزامی نییە کە هەموو قانوون و یاساکانی رابردوو هەڵوەشێنێتەوە و بنەبڕوای بکا. شێعر رووبارێکی مەزنە و رابردوو و دادێی هەتاهەتایە لێکگرێدراوە. سەرچاوەکەی بە زارەکییەوە نووساوە. لە جیهانیشدا رووبارێک نییە کە زارک و گەروی هەبێ و سەرچاوەی نەبێ.
مەترسی دووهەم کە بە سەر شێعری عەرەبدا زالە ئەوەیە شێعری نوێ پردی پێوەندی خۆی و خەڵکی عەرەب بپسێنێ و خۆی لە خەڵک دوور خاتەوە.
گەڵی عەرەب ئیدی لە سەرداوەکانی ملەوڕیی و سیحر و تەلەکە وەدەرکەوتووە. بە بڕوای من شاعیری عەرەب دەبێ رێ رووناک بکا و شێعر بکاتە خۆرە تاوێک کە بوو هەموو رێ لێ وون بووو ترسنۆک و ئازارێکیش و بەڵالێدراوانی ئەم ئەردە هەڵبێ و تینیان بداتێ.
ئەوەی ئێستا بەرچاوە و لە زەوینەی شێعردا باسی دەکرێ. ئەوەیە کە کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی عەرەبدا ئەو پێوەندییە هەرەقایم و باشەی نێوان شاعیری عەرەب و خەڵکی عەرەب دەپسێ و خەڵک بۆ یەکەم جار پشت دەکاتە ئەو شاعیرەی کە پازدە سەدە پێکەوە ژیاون.

41

شێعری عەرەب لە قەیران دایە یان کەوتۆتە نێو چاڵەوە.
تۆ سەبارەت بەو قەیرانە دەڵێی چی؟ هۆیەکەی چۆن دەبینی و چۆن دەکرێ لەو چاڵە وەدەرکەوێ؟
- شێعری عەرەب کەوتۆتە نێو قەیرانی بێ متمانەیی خەڵکەوە.
ئەو لە قاتی نەوت و نۆی قەسیدە کەونەوە خۆی فڕێ داوە و تا ئێستاش هەر لە نێوان ئەرد و ئاسمانی حەوتەم دایە. لاقی لە لێواری بەرهەیوان و باڵاخانەی قەدیم هەڵحلێسکاون.جێیەکی دیکەشی دەس نەکەوتووە کە لە جیاتی ئەو خۆی پێوە هەڵاوەسێ,
هەموو ئەو رووداوانەی کە لەو بەرزاییە دەقەومێن خەڵک گاڵتەیان پێی دێتێ، لە خوارێ ڕا پێیان پێدەکەنن. فیکەیان بۆ دەکێشن و تانە و تەوسی خۆیان دەگرنە ئەو شێتە کە بە سەریاندا بەردەبێتەوە و نازانن لە کام ئەستێرەڕا هاتوون. نایناسن و بە زمانێک دەپەیڤێ کە لێی تێناگەن. من دژی شێتی و شێتان نیم چونکە شێتی و داهێنان لێک دەگێرنەوە.
بەڵام دژی بازدان و خۆفڕێدانی بێچەترم لە پەنجەرەی مێژووەوە.
کەس ناتوانێ شاعیر ناچار بکا لە کونێکدا دە درێژاییەکەی گەزێکە و پانایەکەشی میترێکە بمێنێتەوە.
کەسیش لە شاعیری ناوێ لە گرتووخانە و بەندی قەسیدەی "عمودیە"دا خۆی زیندانی بکا. کەسیش داوامان لێناکا عابای "فرزدق" لەبەر کەین و لە شەقامی سووردا پێوەی بگەڕێین. ئێمە نە کونینە ناسین و و نە مێژووپشکن. بەڵام لە شاعیرمان دەوێ لە سەر لانی کەمی داخوازی شێعر لە گەڵ ئێمە هاوفیکر بێ.
لەومان دەوێ ببێتە هاورێی ئێمە و شەریک و قسەکەری رەسمیی شادی و خەمەکانی ئێمە.

لێمان دەوێ لە کۆڕی دانیشتن و کۆبوونەوەدا دیموکرات بێ. شێوە و زمانی دیموکراتی بێ. چونکە ئەو شاعیرەی بە کردەوە دیکتاتۆر و سەرەڕۆ بێ و زمانەکەشی ترۆریستی بێ ، لە لای ئەو کەسانەی شێعریان بۆ دەخوێنێتەوە دادیی نابێ.
ئێمە لە هەڵبەستڤانی نوێمان دەوێ "سرووشتی" بێ. چونکە ئەم بەرهەمە شێعری یانەی کە ئەمرۆ دیاننخوێننەوە دژی سرووشتن دژی خەڵکن دژی شاعیر و دژی نیزامی شێعرن.
دەڵێم "نیزامی شێعر ". چونکە هەر بزووتنەوەیەک نیزامی تایبەتی خۆی نەبێ بە ناچار بەرەو نەمان دەچێ.
ئەوەش کە دەگوترێ بزووتنەوەی شێعری نوێ شۆڕشە راست نییە. چونکە هەر شۆڕشێکی راستەقینە نیزام و سیستمی خۆی لە گەڵ خۆی دێنێ. ئەگەر وانەبێ ئەو شۆڕشە بەرەو نەمان دەچێ.
شۆڕشگێڕی راستەقینەش چ سیاسی  بێ و چ وێژەیی دەبێ بیچم و شکڵی دادێی خۆی بێنی چونکە هەر شکلێک بۆ خۆی سیستم و نیزامێکە بە بێ ئەو سیستم و نیزامە شۆڕش و شێعر بە کردەوە دەبنە کاری ئانارشیستی و هەرچی و پەرچێتی.

**لە مەڕ خوێندنەوەی شێعر**

کاتێ شێعرم پێشکەش دەکەم دڵم بە گوڕ لێدەدا. وەکوو ئەو تەپڵانەی کە لە لێرەواره چڕ و پڕەکانی لێدەدرێن. ئێش و ئازاری شمشێری دەرکی چشراو لە کاڵانەکەی و هاوار و دەرد و رەنجی هەوری ئاوسی بەر لە بارینی باران هەست پێدەکەم.کاتێ شێعرم دەخوێنمەوە گروپی خوێنم دەگۆڕێ.دڵم لە هەموو ئەستێرە گەرۆکەکانی ملوانکەی رۆژ گەورەتر دەبێ و رووبەرووی دەستەکانم وەکوو خەم و ئازادی دەکاتە مەودای ئەفسانە.
کاتێ شێعرم دەخوێنمەوە دەبمە مرۆڤێک کە سەر بە ئەستێرەیەکی دیاری کراو یان جنسێکی دیاری کراو یان بەشێک لە سەردەمێکی دیاریکراو نییە. دەبمە ژیاری هەموو گەڵ و هەموو جنسی.
هەر کاتێ بۆ خوێندنەوەی شێعرەکانم چوومەتە شوێنێکی گشتی وام زانیوە شێعرەکانم بۆ جاری دووهەم دەنووسمەوە.
بەو رادەیەی کە "نڤیسێک" لە خۆڕا دادەنێم ئەوەندە دەق و نڤیسێکی شێعری ناخوێنمەوە، ئەوەندە حالەتێک دووپات ناکەمەوە. کە حالەت چێدەکەم.
پێشکەش کردن و خوێندنەوەی شێعر لێرەڕا دەبێتە کارێکی داهێنەرانە و نەخشگەریی و نیگارکێشان بە دەنگ و ئیماژ و ئیشارەت.
شێعری نووسراو و لە سەر پەڕە کاغەز شتێکە و  شێعری نووسراو لە سەر دڵی مرۆڤ شتێکی دیکەیە
شێعر بەر لەوەی بە خەڵک بگا، بۆقێکە لە گیانەڵڵا دایە. هەر کە مرۆڤ لێی نزیک بووە ژیانی دێتە بەر، ئەملاولاکەی دەبزوێ و خۆی فڕێ دەداتە نێو ئاوەوە.
کاتێ شێعر دەنووسم و لە کتێبخانەکەمدا دانیشتووم، وادەزانم پاپۆڕێکی ئاسمانگەڕم و دوور لە هێزی کێشی زەوی مەلە دەکەم.
کاتێ تووشی مرۆڤ دەبم دێمەوە نێو قەپیلەکەی خۆم و جێگەم لە زەمان و مەکاندا دیاری دەکرێ.
شێعر بەر لەوەی بخوێندرێتەوە گەنمێکی حەبس کراوی نێو نێو کوپەلەیە ، کاتێ دەیچێنن دەبێتە گوڵە گەنم و پاشانیش کولێرە.
من ساڵۆنی تەنگ و بچوکی شێعرم خۆش گەرەکە.
خۆشەویستی و ئەوین هەست بە رەحەتی و خۆشی ناکەن مادام کە جێگەیان تەنگەبەر نەبێ. لەو شوێنە تەنگەبەرانەدا دیوارەکان لە یەکتر نزیکن و چوارچێوەی کورسییەکان جوانترن و وشەگەل شکڵ و بیچمی ئەفسانەیی دە خۆوە دەگرن و چاوگەلە گراوییەکانیشمان مەوادی ئەفسانەییان دەبێ.
لەو شوێنە تەنگەبەرانەدا دەنگی خۆم دەبینم دەس لە ملی دەکەم و بۆنی هەڵدەمژم.

لەو شوێنە تەنگەبەرانەدا ناسنامەی تشتان دەگۆڕدرێ. دەشتی خۆشتەوییەکەی من دەبێتە جێ دەستی من. دەمی دەبێتە کتێبێک کە بەر لە خەوتنم دەیخوێنمەوە و دەرزییە لە بیرکراوەکەی بەرۆکی سەر مێزەکەش دەبێتە کۆترێک کە نایەوێ بفڕێ. شەوی شێعر بیچم و شکڵ و نیگارێکی تریفەدارە ، بە هۆی ئەوەوە ئێمە دەزانین لە بەندی ژیان داین. دەزگای کاردیۆگرافی تێمان دەگەیەنێ کە دڵمان بە شێوەی رێک و پێک لێدەدا. و لە نەبوون و بۆشاییدا لێنادا.
شەوی شێعر راپۆرتێکی پزیشکییە و لەو کەسەی دێتە ئەوێ وەریدەگرین. بەو راپۆرتە ئێمە لە ساغ و سلامەتی خۆمان ئاگادار دەبین.
ئەو شاعیرانەی لە پزیشک دەترسن یان کەمتر خەمی دەکەن لە تاقیکردنەوەی تەوژم و فشاری خوێنی خۆیان و خپیشاندان بە دوکتور خۆدەپارێزن یان نایانەوێ خوێنیان تاقی بکەنەوە، لە هەموو ماوەی ژیاندا دەبنە نێچیری خەم و پەژارە و هەر تاوێ لە سەر هەوایەک لێدەخوڕن.
شەوی شێعر تاقیکاری و تاقیگەیە.
بە هۆی ئەو تاقیکارییەوە دەزانیین کە ئەو خوێنەی بە سەر کاغەزەکانمان دا رشتووە خوێنی راستەقینە بووە نە پەلەی کوکا کوڵا .شەوی شێعر ئاوێنەیە و شاعیر روخساری خوَی تێدا دەبینێ.
ئاوێنە کەرەسەی تایبەتیی ژنان نییە و هەر ئەوان کەڵکی لێ وەر ناگرن .
شاعیریش پێویستیی بە چاوی خەڵکە ،بۆ ئەوە رۆخساری راستەقینەی خوَی بە بێ رەنگ و رازاندنەوە تێیان دا ببینێ.
کاتێ ئاوێنەی شاعیر بشکێ ،ئیدی توانایی ئەوەی نامێنێ جیگەی کەپۆ بیچمی دەموو رەنگی چاوەکانی بزانێ .
پاش چل ساڵ کاری شێعر یی خۆم ،هەر بەۆ جورەی شاگردێک دەچیتە ئوودەی تاقیکارییەوە دەچمە ئودەگەڵی شێعر خویندنەوە .لەرزینوو دڵەتەپە و دە م و لێووشکییم هەر وا لەگوڕێ دایە .
پاش چل ساڵ هاوریی شێعر نەم توانیوە بە سەر هە موو هەستە کانم دا زاڵ بم .
لێدانی دڵم رێک و پێک بکەم و هەڵس و کەوتم وەکو لە سەرخۆیی سەرۆکی زانستەکە بێ . ئەوەش ژانی مرۆڤایەتییە دەرمان ناکرێ ,باوەر ناکەم هیچ هونەرمەندێک لە جیهاندا لەو ژانە کەم بکاتەوە .یان لە یەکەم دەمی روویە روو بوونی لە گەڵ خەڵک وەڵای بنێ ,شەوی شێعر خوێندنەوەی من بەو جۆرەی ئێوە پێتان وایە بە لە خۆبایی بوون و خۆ بە زل زانییەوە کۆتایی پێنایە ، بەڵکو بە گریانەوە کۆتایی پێدی.
پاش هەر شەوێکی شێعر خوێندنەوەی سەرکەوتووانەم دەچمە جێوبانەکەمەوە و دەگریم. رەنگە ئەسرینەکانم ئەو نامە نهێنیانە بن کە بۆ ئەو چاوە پاقژانەی دەنێرم کە خاوەنەکانیان ناناسم و
ئەسرینەکانم ئەو نامە نهێنییانە بن کە بۆ ئەو چاوە پاقژانەی دەنێرم کە خاوەنەکانیان ناناسم و ناوەکانیان نازانم بەڵام ئەوەندە دەزانم ئەوان لە برژانگەکانیان عابای شێعریان درووس کردووە کە من لە بەری دەکەم.
لە کۆتایی هەر شەوە شێعرێکدا من وەکوو کەلەشێر باڵی لێ فش ناکەم. بەڵکوو لە خوا دەپاڕێمەوە هێزم بداتێ و سینگم بەرفراوان و زمانم پاراو بکا تا جارێکی دیکە لە خەمی خەڵک نزیکتر ببمەوە و بۆ راگەیاندنی دەنگیان وردبینتر بم.



خەڵک..خەڵک...خەڵک
خەڵکی عارەب لە جوانی بێ بەشە.
ئەوە تانووت و بوختانی مەزنی منە کە وەکوو گوڵی سوور لە بەرۆکی ژاکێتەکەمی دەدەم و وەکوو تاووسی ئەفریقایی خۆمی پێوە رادەنێم.
تاوانبار کراوم کە لە گەڵ ئەو خەڵکە پێوەندییەکی زۆر باشم دامەزراندووە تاوانبارم – ئەوەش گەورەترین تاوانە– بەوە کە نووسیم لەو خەڵکە دەچێ.

ئەمن قسەی نەستەقتان بۆ ناگێڕمەوە. بەڵام ئەوە بە تەواوی ئەو شتەیە کە لە قاوەخانەی رۆشنبیریدا لە سەر منی دەلێن.
ئەی گەڵۆ شێعرێک بنووسم لە گەڵی تانزانیا بکا؟ یان لە خەکی موزامبیک؟ یان مغوڵستان یان لە خەڵکی وولتای ژوورو بچێ؟
خەڵک نە گرتووخانەیە نە تەنافی دار و نە گرتووخانەی عەسکەری.
خەڵک ئەسپێکی عەرەبیی بە هۆشە. ئەگەر بزانین چۆنی لە گەڵ رەفتار بکەین ، ئەوە لە کێبڕکێدا دەیبەنەوە.. ئەگەر لە خوو و خدەشی نەگەین، فڕێمان دەدا و بە سەرماندا تێدەپەڕێ.
خەڵک وشەیەکە ترسنەکان لێی دەترسن. ئەو چ گیرو گرفتان چی ناکا مەگەر بۆ ئەوانەیخۆ لە خۆدا گیر و گرفت و گرێ و گۆلیان هەیە.
ئەو شاعیرانەی لە هەڵبژاردندا لە لایەن گەلەوە وەلانراون و کەوتوون وەکوو ئەو سیاسییانەن کە لە هەڵبژاردنی گشتیدا لێ کەوتوون و چ لێکدانەوەکیشیان بۆ سەرنەکەوتنی خۆیان نیەە. مەگەر ئەوەی حکوومەت بە فێڵ و تەلەکە و دەغەلی تاوانیار بکەن و خەڵکیش بە تێنەگەیشتوو و نەفام بزانن , لە راستشدا خەڵکی عەرەو نەفام نییە و خەتاکاریش نییە. بەڵام شاعیری نوێ بێژی عەرەب ئەو کەسەیە کە هێزی هاوفیکری و خۆ رێکخستنی لە گەڵ چاخ سەردەمەکەی خۆی لە دەس داوە و ناوی شەوی بیرکردووە. لە بەر ئەوە شارەکانی عەرەب دەرگای خۆیان لە سەر گالە داوە. خەڵک بۆ هێندێک شاعیر سەرچاوەی خێر و خۆشییە و بۆ تاقمێکیش سەرچاوەی ترسە, لەوانەی خەڵکیان لە گەلە ئەو لە گەڵ بوونە بە شتێکی سرووشتی دەزانن و ئەو شاعیرانەی کە خەڵکیان لە گەڵ نییە ئەمە بە نزمی و وەپاش کەوتوویی فەرهەنگی و ئەدەبیی گەڵ دەزانن.
ئەو شاعیرانەی سەرکەوتوون زاریان ناکەنەو، ئەوانەی کە بازاڕیان نییە ئەو بێبازاڕییە لە نەزانی خەڵک دەزانن و بە عابای خەڵکەوەی گرێ دەدەن و لە کەم زانی خۆیان و عەیبی کاڵاکەی خۆیانی نازانن.
لە راستییدا خەڵکی لایەنگری شێعر و نەلایەنگری شێعر لە گۆڕێدا نییە.
وا هەیە شاعیرێک بە شێوەی بنەڕەتی و رێک و پێک یاری بە پەڕی شێعر دەکات. شاعیریواش هەیە لە یارییەکەیدا فێڵ و دەغەلی دەکا. شاعیری وا هەیە هەزاران مایل رێ دەبڕێ بۆ ئەوەی بە وانی دیکە بگا. شاعیری ئەوتۆش هەیە توانای هەڵدانەوەی ئەو لاپەڕەیەی نییە.کە لە سەری دەنووسێ. شاعیری واهەی لە پانایی دەریادا مەلە دەکا. شاعیری ئەوتۆش هەیە لە خاڵ و نوختەی جەوهەری قەلەمەکەیدا نوقم دەبێ . شاعیری وا هەیە لە گەڵ جیهان جووت دەبێ. شاعیری ئەوتۆش هەیە کە لە تەنیاییدا بە سەر دەفتەرە کانییە وە دەمرێ و کوڕەکەشی لە سەری ناگرێ و کەسیش رەگەڵ جەنازەکەی ناکەوێ .شاعیری ئەوتو هەیە زەووزا ، وە چە لێکەوتنەوە شادی دەکا . شاعیری واش هەیە نەزوکیی لە منداڵداریی پێ باشترە خەڵک لە مانای راستەقینەی دا جیا لەو کۆمەلە منداڵە نییە کە ئێمە لە رێی شێعرەوە هێناومانن ، ناوی ئێمەشیان بە سەرە وە یە وبوونی ئێمە بەردەوام لە زەمان و مەکان دا دەستە بەر دەکەن .
شێعر لەساکارترین و بە ربڵاوترین مانای خۆی دا ئەو ووتە و ئاخافتنەیە کە ئێمە بە هۆی ئە وە وە خەڵک فام بکەین ولە یەکتر بگەین .
شێعر ماچ و راموسانە . بۆ ئەوە ئەو راموسانە دەس بدا و پێک بێ ، دەبێ دوولایەن هەبن .
مرۆڤ بۆی نالوێ خۆی ماچ بکا . بو شێعریش نالوێ حەز لە خۆی بکا و خۆی بحەبێنێ.
کاتێ گوتمان شێعر زمانە مانای ئەوەیە کە دەبێ چەند لایەن هەبن تا پێی بدوێن بۆ ئەوە زمان پێک بێ. زمانێکی ئەوتۆ لەم جیهانەدا نییە هەر تاکە کەسێک پێی بدوێ تەنانەت زمانی پەلەوەر و مەل. مێشە هەنگ و قورواقی چۆم و رووباران و سیسرەی نێو باخ و لێرەواران گەشە ناکەن مەگەر هەل و مەرجی کۆمەڵایەتییان بۆ پێک بێ و کامل بێ.

**کومەڵی خەڵک بۆ شاعیر کرۆنومێترە. بێ ئەوە ناتوانێ شوێنی بوونی خۆی لە زمان و مکاندا دیاری بکا. ناشزانێ داخوا ئەو لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا بووە یان لە سەدەی بیستەمی زایینی.**
**من خۆم فڕێ دەدەمە نێو رووباری خەڵکەوە. لە دەور و بەرم جەغز و بازنەی زێڕین و یاسەمەن سەرهەڵدەدەن. ئەم بازنانە لە بەندەر و لەنگەرگەی مینا لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو لەنگەرگەی وەهران لە رۆژئاوا دەخزن.**
**خۆم لە خوێنی گەلدا نوقم دەکەم و گەڵ لە خوێنمدا نوقم دەبێ.**
**مشتەری قاوەخانەی رۆشنبیری بە تووڕەییەوە هاوار دەکەن و دەڵێن من هەستی خەڵک قانە قدیلە دەکەم.**
**بە ژێی موسیقای کەم و کوڕییەکەی یاری دەکەم و سەری بۆ دادەنەوێنم.**
**من ئەو بە گرنگ ناگرم سەفەرەکەم بەرەو بەندەر و لەنگەرگەی پڕ لە ئاپۆرە درێژە پێدەدەم.**
**ئەو شاعیرەی بە تۆ دەلێ پێ خۆش نییە پچێتە مەلە کردنی خەڵک چونکە پڕایی خەڵک و حەشیمەت نارەحەتی دەکا، زۆری منداڵی لێیە ، دەریا خاوێن نییە و لە کافەترياش بیرەی سارد دەس ناکەوێ وای دەگەیەنێ کەم و کوڕییەکە لە هونەری مەلە کردنی خۆی دایە و هی دەریا نییە.**
**خەڵک چارەنووسی منە هەر وەکوو من چارەنوسی ئەوم.**
**من نەبووم و ناتوانم ببمە شاعیرێکی ئیسکاندیناوی ، چ ،مانای نییە شاژنی وڵاتی سوئێد خەڵاتی نوبێڵ بە من بدا.**
**ئەوەی ئەو خەڵاتە مەزنە بە من دەدا ئەو هاونیشتمانییە عەرەبەیە کە من شێعری بۆ دەنووسم بێ ئەوەی ناوەکەی بزانم.**
**ئەو خەڵاتە هەر دار خورمایەکی سارا دەمداتێ کە سەرەتای خوێندن و نووسین و سەرەتا بنەڕەتی خۆشەویستی و حەباندن لە سەر دەستی من فێربووبێ.**
**ئەو خەڵاتە مەزنە هەر ژنێک دەمداتێ کە بە قاچاغی بە نێو تەلی گرتووخانەدا گوڵی سوور و کۆتر و دیوانی شێعرم بۆ بردووە.**
**من نە خەڵاتی ئەمەگناسیی لە کەس داوا دەکەم و نە دوکتۆرای شانازی کەسم دەوێ.**
**خەڵکی مەزنی عەرەب خەڵاتی گەورەی منە. هەر ئەوە هێز و باوەڕ بە خۆییم خەڵات دەکا ناهێڵێ لاشەم بکەوێتە ژێر پێی "امیر مومنین".**
**لە شێعری ئەم دواییانەتدا لە کوێی؟ نزار قەبانی چلەکانی ؟ڕێبازەکەتم بۆ دیاری بکە.**
**هەڵسەنگاندن و دیاری کردنی کاتی شێعر ئاوا بە هاسانی ناکرێ. واتە بە شێوەی دەرگە و پەنجەرەی کۆشک ئەندازە دەگرین.**
**شاعیر و هەڵبەستڤان کۆشک و تەلار نین. وێژەوان شەپۆلێکە بەردەوام لە نێو دەبا و هیچ حالەتێکی وەکوو حالەتی پێشووی نییە. تۆ لە نزار قەبانی چلەکان دەپرسی، من لە چلەکانەوە نەمدیوە. لە گەڵی دانەنیشتووم لەو کاتەوە کە خوێندکاری زانکۆی حقوقی زانستگەی دیمشق بوو لە گەڵی نەدواوم.**
**رەنگە واقت وڕبمێنێ پێت سەیر بێ ئەگەر بلێم من فرم بەو نزار قەبانییەوە نییە.**
**ئەوەی دەیلێم لە کەم مەیلی و بێئەمەگی منەوە نییە یان لە بێوەفایی بۆ ئەو نزار قەبانییەی دیکەوە سەرچاوە ناگرێ.**
**ئەمەگناسی و وەفاداریی لە شێعردا هەر بۆ شێعرە و بەس.**
**بە راشکاوییەوە دەڵێم هیچ وەفایەکم بۆ ئەو شێعرانەی خۆم کە کۆتاییان پێهاتووە نییە کات زەمانی شێعر لە لای من هێندیک زەمانی دیکە بە شێوەیەکی دڕندانە قەڵت و بڕ دەکەن کە وێنەیان نییە.**
**هەر شێعرێکی نووسراو بڵاوکراوە بە لای منەوە شێعرێکی وون بووە.**
**لە بەر ئەوە رادەگەیەنم من شاعیرێکی فەراموشکارم.**
**دژوارە پێت بلێم من لە کوێم و نزار قەبانی چلەکان لە کوێیە. بەینی من و ئەو هەزاران ساڵی نوورییە. ئەو بە ڕێی خۆیدا چووە و من بە رێی خۆمدا رۆیشتم.**

جوانیی و دزێوی روخسارمان جیاوازن. خوو و خدەمان جیاوازن. شێوە ئاخاتنمان جیاوازن ناتەباییەکانمان روو لە زیاد بوونن.
ئەو هەروا لە قوتابخانەی شادیی دایە و من لە زانکۆی خەم سەرکەوتووانە دەرچووم.
لە هەر حاڵدا ئەگەر تۆ نزار قەبانیی دووهەمت دی سڵاوی منی پێبگەیەنە.
بەڵام لە مەڕ ڕێبازی شێعرم گرینگترین شت ئەوەیە بناغەی دیموکراسیم لە شێعردا بەرزکردووەتەوە بە گشتی خەڵکم هێناوەتە نێو "هەرەوەزی شێعرە"وە.
45
بۆ خۆت پێم وایە سەرکەوتووی یان تێشکاوی ؟
- من ئەو کەسە نیم وەڵامی شەو پرسیارە بدەمەوە.ئەوە بە ملیون خوێنەری عەرەبن کە حەز لێکردووییان کردووە. جووت بە ست بوون. زەوجیون ، منداڵیان لە سەر دەستی من یان لە سەر دەستی شێعرەکانم لێکەوتوونەوە. ئەوانن کە وەڵامی تۆ دەدەنەوە. پاش سێ ساڵ مانەوە لەو تاقیگەیەدا بۆم دەرکەوتووە و بۆم سەلمێندراوە کە راستەقانیەتی شێعر نە لە لوولەی تاقیگە دایە و نە لە کیمیادا.. بەڵکوو راستەقانیەتی شێعر لە مرۆڤ دایە. بە وتەیەکی دیکە مرۆڤ تاکە سەرچاوەی دەسەڵاتی شێعرە. ئەو دەسەڵاتە دەدا بە هەر کەسێ. کە بیەوێ و نایدا بە هەر کەسێک کە پێی خۆش بێ.
لە بەر رووناکی ئەو لەزگەدا دەستم کرد بە پاقژ کردنەوەی مەزاری شێعر . بەردەکانم لێ فڕێ دان، لە بزمار و گژوگیا پاکم کردەوە و لە شۆرەکاتیش رزگارم کرد.
بەرە بەرە روالەتی شۆرەکاتەکە گۆڕا. خەڵک بە ژن و منداڵیانەوە هاتن بۆ ئەوەی کاتی پشوودانی ئاخری حەوتەیان لە لای من تێپەڕکەن.
لە سەرەتادا دە کەس بوون. پاشان بوون بە سەد و هەزار و دوایە بوون بە ملیۆن.
هەموویان پاسپۆرتی کۆماری شێعریان پێیە. واتە ئەو کۆمارەی من لە سەردەمی قوتابێتیم لە قوتابخانەی مام ناوەندی لە شاری دیمشقدا دامەزراندبوو. ئەم کۆمارە ویزای ناوێ. جانتای کەس ناپشکێنێ و قانوونی گومرکی ئەم کۆمارە خوێندنی مل ناگرێتەوە.
ئەم کۆمارە ئاڵاشەکاوەیە، کۆماری منە.
هەموو رۆژێ هەر لە ئاوەکانی "شەت العرب"ڕا هەتا ئوقیانووسی ئەتلەس هاوڵاتییەکانی کۆمارەکەم بە سەردەکەمەوە.
تەنانەت دەتوانم ئیدیعا بکەم توانیومە بەر لەوەی فەرمانڕەوایەکی عەرب یەکێتی سیاسی لە نێوان عەرەباندا پێک بێنێ، یەکگرتوویی و یەکێتی وڵاتانی عەرەب لە بارەی شێعرییەوە پێک بێنم.
46
لە کۆمەلە شێعرێکتدالە ژێر سەردێڕی "بۆ یادی بەیروت لە گەڵ ئەوینم" بە نیگایەکی رێبوارانەی بێلایەنەوە کوژەر و کوژراو، کەتنکەر و کەتنپێکراو دەخەیە قەرتالەیەکەوە. بۆ ئەوە دەلێی چی؟
لەو کومەلە شێعرەدا کوژراو و کەتنپێکراو یەکە، ئەوەیش "بێروت"ە. من نە پارێزەری گشتیم نە دادوەر و پشکنەری دادگەم تا هەف نڤیسی تاوان ئامادە بکەم. منی شاعیر دەڕوانێتە ئەو شارە بەرەڵاکراوە کە دەسووتێ، بە هیچ و خۆڕایی ، بە مانا سەردەبڕدرێ و بە شێوەی تایبەت بە خۆی هاوار دەکا، هانا ناکرێ نە دەستە راستی بێ نە دەستە چەپی، نە لیبراڵی نە مارکسیستی ، نە ئەمریکایی بێ نە رووسیی، هەر وەک ئەسیرین کە ئەویش نایەتە نێو یاری گەلانەوە. مرۆڤ هاواری کردووە بەر لەوە حیزب و رێکخراوە و میلیشیات پێک بین.
لە بەرامبەر وەحشیگەری و خوێنڕێژی و بەربەریدا هاوار هەر دەکرێ .
سەرە بڕاوەکان سێو نین کە بە "گوڵدن و ستارکن" دابەش بکرێن. ئەو خوێنەی کە رژاوە ناکرێ بە دەرەجە یەک و دوو و دەهەم دابەش بکرێ. خانمولەکەم! داوام لێ مەکە پۆل پۆل فرمێسکەکانم هەڵڕێژم

چونکە من باوەڕم بەو فرمێسکانە نین کە لە "مصیگبە و برج ابی حیدر" ڕۆدەڕژێن.هەروەها بەوانەی کە لە "جمیزە و اشرفیە"ش دادەچۆڕێن بەو جۆرەی تۆ دەلێی من سەیرانکەر و تەماشاچیم . بەڵام ئەزموونی شەڕ ئەوەی سەلماندووە کە تماشاڤان و گەڕۆکی وەکوو ئێمە بۆ لوبنان لە هەمووان بە ئەمەگترین. هەروەها لە هێندێک لەوانەی کە پێناسەی لوبنانییان پێیە. گیرۆدەییمان بە لوبنانەوە زیاترە. ئەوەم قبوڵ نییە کە جوغرافیای خەمی من ئاوا بەرتەسک دیاری بکرێ. کەسەر و خەمی مەزن بۆ هەموو جیهانە نە ئەوەی کە هەر لە خەمی زارۆکەکانی گەڕەکەکەی خۆمدا بم.

47

تاوانبارم کردی کە تۆ لەو کۆمەلە شێعرەی ئەم دواییانەتدا لە گەڵ "بێروت" بورژوایانە جوڵاویتەوە و هەوڵت نەداوە تێبگەی لەوێ چی ڕوویداوە مەگرە بە سۆنگەی شوێن و دام و دەزگا جوانەکانییەوە بێ ئەوە سەرنجدت دابێتە مرۆڤ و ئێش و ئازار و هەژارییەکەی.

– با باسی بورژوا بوونەکەی ئێمە ببڕێتەوە. ئێوە بە کردەوە بورژوا و سەر بە بورژوازیین.. بەڵام ئیمە هەر بە قسە بورژواین. سێ لە چواری ویسکی دزراو لە شەڕی لوبناندا "شۆڕشگێڕان" بەسەریانەوەنا. سێ لە چواری ئەو نانانە لە نانەواخانەکان دەهاتە دەر "شۆڕشگێڕان" خواردیان .بەڵام هەژارەکان کە پارێزگارییان لە خەم و ئازار و بنەبڕکردنیان کرد، کەس لە ماوەی ئەو هەموو سالە پڕ لە ئازارەدا کولێرەیەکی گەنمی بۆ نەبردن. کەسیش بە شووشەیەکی ویسکی بە سەری نەکردووە تا ئەوانیش خەمەکانیانی پێ بشۆنەوە. چونکە ویسکی خواردنەوەی سەرۆکان و تیئوریداتاشانە. فەقیر و هەژار نامرێ مەگەر لە حالەتی وشیاریدا نەبێ. تکاتان لێ دەکەین لەو ئێمە لەو مەوعێزە و ئامۆژگارییانەتان ببوێرن. ئەوە قەوانێکە و ئێمە  بە دڵ گوێی بۆ ڕاناگررین.

ئەگەر قسەتان لە سەر نیگارەی "زغتر"ە کە "بەهاکەی 50 قروش"ە یان لە مەڕ "کوڕنیش".. و ئەو منداڵانەی گەردەنبەندی یاسەمەن یان بنێشت یان شانس یان نەسیب دەفرۆشن و بە بڕوای ئێوە ئەمانە بورژوازین...خۆ ئەو بورژوازییەی ئێمە بێعەدالەتی نەکردووە.

بگەڕیوە سەر پێشەکی کتێبەکەم "بۆیای بێروت" خانملەکەم! لەوێدا دەبینی کە من حەز لە بەرد و سمیت کونکرێت نەکردووە. قەتم باسی دام و دەزگا نەکردووە. بەڵکوو لەوێدا لەو مرۆڤە دەدوێم کە ماڵی بە سەردا دەڕوخێ. خێوەت لە شێعری عەرەبدا مانای ئەو قوماشە نییە لە موو و خوری ساز کرابێ مانای ئەو مرۆڤەیە کە لە ژێر خێوەتەکە دادەنیشێ مانای ئەو قوماشەیە کە لە گۆشت و بیرەوەرییە هاوبەشەکانی شاعیر و ئەو تشتانە پێک هاتووە.

ئەو زێدەی لێ بووم نەیکرد خوشحاڵم ، ئەو کەسەی لێی بوو بۆ ئەو بێ حاڵم.

48

کاتێ ناصر مرد تۆ پێتدا گوت و کوشتنەکەی ئەوت مەحکووم نەکرد. هەروەها کاتێ شێعرت بۆ لا لاواندنەوەی بێروت نووسی فرمێسکت بۆ هەڵڕشت بەڵام فرمێسکی کێ؟ ئەگەر ئەوە فرمێسکی ئەویندار بوو ، ئەم فرمێسکە بەس نەبوو ئەگەر بێروتت لە بەر ئەوە خۆش دەوێت کە بێروتە ، ئەو خۆشەویستییە نەرەوونە. یا لە بەر ئەوە خۆشت دەوێ کە بەیروتی ئەوە خەڵکەیە کە لە بەر خاتری ئەو لە خەم و خەفەت و دەردا لە پێ کەوتن، ماندوو بوون، شەق بوون و بۆ ئەو کوژران یان چونکە بێروتی ساڵۆنی گەورە و کومەڵگەی مەخمەرینە؟ بۆچوون لە مەڕ ئەوە چییە؟

–جارێکی دیکەش پێت دەڵێم من بنکەی پۆلیس نیم تا وەدووی کوشتنی " عبدالناصر" و بێروت بکەوم. ئەمن ئاتاگریستی نیم تا وە شوێن پەنجە موارن بکەوم و دەوسیە و هەڤنڤیس پڕکەمەوە و گەماڵی پۆلیس وەگڕ خەم.

منی شاعیر ئەرکی ئەوەیە زەنگی وشیار کردنەوە لێدا و ڕووناکی بخاتە سەر شانۆ و نیاری تاوان.

عەرەب "ناصری" کوشت ( ئێوە ئەوە دەزانن و منیش دەزانم) هەروەها "بێروت"یش. لە پێوەندی ئەوینی من بە بێروتەوە دەلێم، من بەر پرس و بەر عودەی ئەوە نیم کە بۆ سەلماندنی ئەوینی مەزنی خۆم لە کوێخای گەڕەک داوی بڕوانامەی ڕەفتارباشی بکەم.
ناشپرسم ئاخۆ ئەو ژنە خۆشم دەوێ ملیۆنێرە یان لە سەر حەسیری گرێ چنە. شێتۆکەیە یان ژیرە. مووسولمانە یان گاوڕە، زانکۆی تەواو کردووە یان قوتابخانەی مام ناوەندی، کچێنییەکەی سەر بە مۆرە یان ئەزموونی جینسی هەیە شێعری عەرەبی پێ خۆشە یان فەرەنسی دەنگی "ام کلپوم"ی خۆش گەرەکە یان "خولیو ئینگلزیا"؟
هەروا خۆشم دەوێ "بێروت"یش.
دەشتی خوێن و گەوهەر
هەروا خۆشم دەوێی بەیروتی دلپاک، بانگ و هاوار.
بەیروتی برسێتیی کافر، تێری کافر،
هەروا خۆشم دەوێی بێروتی داد، زولم و ستەم
بەیروتەکەی کوژەری شاعیر.
49
ئاگات لەوە هەیە کە لە هێندێک لە شێعرەکانتدا سەرکۆنەی عەرەبایەتی دەکەی بەو دەلیلە کە عەرەبایەتی تەنیا بازرگانی نەوتە و لە بیرت دەچێ کە ئەم سەرکۆنەیەت خەلکی ئاسایی و ساکار و پاڤژانیش دەگرێتەوە.؟
– عەرەب دووانن عەرەبی حاکم و عەرەبی مەحکووم.
عەرەبی مەحکووم بە پاڤژ و ساکارییانەوە ناتوانن چلەموویەک لە سەر سولتان بکەنەوە., ئێمە ئەگەر بلێین نەوت لە ژیانی ئێمەدا تەحر و بیچمی "وەلە چاخ و قەزا و قەدەر" بە خۆیەوە ناگرێ درۆ لە گەڵ یەکتر دەکەین.
من جاری وا هەیە پێم خۆشە بە گژ قەزا و قەدەردا بێم.
50
لە چلەکانەوە کە تۆ شێعرت بلاوکردۆتەوە شاعیریزۆر پەیدا بوون. بیروڕات سەبارەت بەو ئاڵ و گۆڕانە بە سەر شێعردا هاتوون چییە و تۆ لە کام یەک لەو شاعیرانەی؟
– من خۆم لە گەڵ کەس ناخەمە تای تەرازووەوە. من خۆم بە خۆم هەلدەسەنگێنم. بەلێ شێعری نوێ شێعرێکی تێکۆشەر و ئاگایە. بەلام لە دوواییدا خۆی وا دەرنەخست. چاوەڕوانی دەکرێ شاعیرە نوێ بێژەکان لە باسی شێعری نوێدا کەمتر بدوێن و زۆرتر شێعر بلێن و بنووسن.ئەو هەلوێستانەی کە لە مەڕ تیئۆری داتاشین و راهێنان و شیکردنەوە دەیگرن ئەو شاعیرانە دەباتە ریزی رەبەنان و نایانباتە نێو دەستەی شاعیر و هەلبەستەڤانانەوە.
هەلوێستی من لە مەڕ شاعیرە نوێخوازەکان ئەوەیە کە ئەوان نازانن لە چ جێیەکی زەویدا راوەستاون ئەوان بە شێوەیەکی نهێنی لە زمان کەلک وەردەگرن ئەو زمانە غەیبی دابڕاو و تەریک کەوتووە و لە بیردەکەن کە زمان هەمزەی "وصل"ە نە هەمزەی "قگع" واتە پێوەلکان و تێکەل بوونە لە گەڵ [خەلک] نە دابڕان. دەفتەر و دەستە چەکی جووت بوونە لە گەڵ خەلک نە سەنەدی لێک دابڕان.ئەوەش بووەتە دیواری بێ متمانەیی لە نێوان شاعیر و خەلکی سادە و ساکاردا.
ئێوە بەردەوام باسی ساکار و خەلکی ئاسایی دەکەن . لە وتووێژەکانتاندا لەوان دەدوێن، لە تیئۆرییە داتاشینەکانتاندا، لە بلاوکەکانتاندا خۆتان بەوانی گرێ دەدەن. بە لام لە راستیدا کارێکیان بۆ ناکەن. تەنانەت تاقە شەمێکیش لە شەوی خەمەکانیاندا هەلناکەن. ئێوە بە ئاشکرا بە کەمیان دادەنێن، بازرگانی بە فرمێسکەکانیان دەکەن.
ئەگەر ئێستا سەردەمی ئیشتراکییە گەلۆ شێعری نوێش ئیشتراکییە؟

تۆ بلێی ئەوە شێعرێک بێ کە رەنجدەران پێویستیان پێی بێ؟
من سەرەڕای ئەو هەموو پڕوپاگەندەیە دەکرێ پێم وا نییە شێعری نوێ شێعری " ئیشتراکیی"ە . بە پێچەوانەوە شێعری نوێ نوێنەرایەتی بەرزترین پلەی پاوانخوازی دەکا.

51

ئێستا کە بۆ رۆژنامەکان دەنووسی مەبەستت چییە؟ گەلۆ ئەوە بۆ کۆکردنەوەی ماڵە یان بۆ دامرکاندنی کورکەی دڵ؟
–من لە ژیانمدا بۆ کۆکردنەوەی ماڵم نەنووسیوە.
نووسین لە لای من تەقەمەنییە، نەیتەقێنم، دەمتەقێنێ.

52

دەلێن هونەری داهێنانی شاعیر و و نووسینی بابەتی حەوتووانە ناتەباییان هەیە . ئایا تۆ ئەو ناتەباییە لە نێوان جوانی شێعر و کاری بە بەرنامەی نووسیندا نابینی؟
–کێ گوتوویە من لەو پەخشانەی شێعری پێدەنووسم لادەدەم؟ نووسراوەکانی حەوتوانەی من هەموو برینی شێعریی و هەموو راز و نهێنییە تێکنیکیە بچوکەکانیشی پێوەیە. من پەیڤ و وتاری رۆژنامەگەری نانووسم.
ئەوی دەینووسم شێعری رۆژنامەوانییە.

53

شێعری کەونی تۆ لە شێعری "العفویە" نزیکترە و شێعری نوێت هێندێک دەسکردە. ئایا ئەوە راستە؟
- دیارە ئەمە ناراستە. شێعری پێشووم میناتۆرێکی زێڕ ئاژنکراو بوو. بەڵام ئەمرۆ هەر بەو رەوانی و سووک و هاسانییە دەنووسم کە هەناسە هەڵدەکێشم.

54

کەسێک بچێتە قووڵایی شێعرەکەتەوە و لێی وردبێتەوە ، تێدەگا کە هەڵوێستت لە مەڕ ژیان سۆفییانەیە . رەوالەتەکەی پووچییە و نێوەڕۆکەکەی ئیمانە. شێعرەکانت دڵتەنگی سۆفییەکان و شادی و ئارەزووەکانیان وەبیر ئێمە دێننەوە.رای خۆت چییە؟
کەسێک بچێتە قووڵایی شێعرەکەتەوە و لێی وردبێتەوە ، تێدەگا کە هەڵوێستت لە مەڕ ژیان سۆفییانەیە . رەواڵەتەکەی پووچییە و نێوەرۆکەکەی ئیمانە. شێعرەکانت دڵتەنگی سۆفییەکان و شادی و ئارەزووەکانیان وەبیر ئێمە دێننەوە.رای خۆت چییە؟
– لە نێوان ئەوین و سۆفێتیدا خاڵی هاوبەش زۆرن . ئەوینداری مەزن لە ئاکامدا دەبێتە سۆفییەکی مەزن. ئەگەر ئامانج و ئاواتی سۆفی نەمان و توانەوەیە لە وجوودی خۆدا، ئامانج و ویستی ئەوینداریش نەمان و توانەوەیە لە وجوودی گراوییەکەدا . تەنانەت وتەی "یاتۆ" لە زمانی سۆفی یان ئەویندارەدا مانای "یامن"ە.
ئەگەر بە وردی شێعری گەورە سۆفییەکان بخەینە بەر چاو وەکوو شێعری "نفری، ابوالعتاهیە، جلال ولدین مولوی رومی، محیالدین عربی و رابعە العدویە" دەبینین هاوتایی و وێچوونێکی زۆر لە نێوان شێعرەکانی ئەوان و شێعری شاعیرانی غەزەلیدا هەیە .
هەر کەس بە شێوەی خۆی ئاشق دەبێ و حەزلێکردوویی دەکا. دەروێش بۆ ئەوەی بگاتە قۆناغی "نیروانا"لە شی خۆی دەبزوێنێ و بزاوتنەکەشی توند و تیژە. شاعیری ئەویندارێش لە سەر هەوا و ئاهەنگەکانی شێعری خۆی موسیقای شۆق و و ئارەزووەکانی خۆی هەڵدەبەزێ نابێتە ئەستێرە و بە دەوری چاوی دەلال و خۆشەویستەکەیدا بگەڕێ.
هەروەها جیاوازییەک لە نێوان ئەویندار و سۆفیدا نییە چونکە لە کۆتاییدا هەر دوو دەبنە پۆلوی سوور لە ئاوری ئەوینی مەزندا.

55

**دەولەمەندی بیچم و شکڵ و لەزک لە شێعری تۆدا بە رادەیەکە دەڵێی بە وشە نیگارکێشی دەکرێ، تەنانەت ئەوەی دەکشێتەنێو شێعرەکانتەوە وادەزانی چووەتە نیگارخانەیەک . گەلۆ ئەم بابەتە بە ڕای تۆ چۆنە؟**

**– شێعر و نیگارکێشان جمکن واتە ئاوەڵ دووانەن. ئەندامەکانیان تێک هەڵکێشراو و پێکەوە نووساون. بۆ من دژوارە پێم وابێ شاعیر نیگارکێشیی ناکا. یان نیگارکێشێ شێعرێ خۆش نەوێ بیرکردنەوەم رەنگینە. نێودێر کردنی کومەڵە شێعرێکم بە "نیگار کێشان بە وشە" لە خۆڕا و بە هەڵکەوت و لەبەر جوانیی و هاولێکیی نەبووە.**

**من لە بنەڕەتڕا نیگارکێشم. هەڵبژاردەی شێعریی من بە سەر ئەوانی دیکەدا دەشکێتەوە. ئەگەر تۆ لە شێعری مندا کەسک و زەرد و سوور و بنەوش وەلانێی، شێعرەکەم وەکوو شاری نیویورکی لێدێ کە هێڵی کارەبای پسابن.**

**لەبەر ئەوە جار و بار دەچمە ئودەی منداڵەکانم ، ماتە هومەر و زەینەب، قوتوی رەنگ و فڵچە و دەفتەرە رەسمەکانیان لێدەدزم و دەس دەکەم بە تێکوەردانی رەنگەکان. قامک و جل و بەرگەکەم رەنگاوی دەکەم.**

**لەو ئاسمانی نیگارکێشییە کە چل ساڵ لەمەوبەر لێی بەربوومەوە هێشتا هەر چاو لە دویم.**

56

**شێعری تۆم بە دەسخەتی خۆت کەوتۆتە بەر چاو هەروەها سەربەرگی کۆمەلە شێعرەکانت هەر بە دەسخەتی خۆتن . وام بە خەیاڵدا دێ کە تۆ دەتەوێ لە گەڵ هونەر یاری بکەی و کایە بە شێعر بکەی ، ئایا ئەمە راستە و کارێکی ئەوتۆ دەکەی؟**

**– بەڵێ، بەڵێ. کاتێ دڵم تەنگ بێ بە دڵمدا دێ یاری بکەم.**

**لە پیتی چاپی کە لە دەنکی باقلا دەچن دڵم دەگیرێ، مانگێکی تەواو رۆدەنیشم و شێعرەکانی خۆم بە ئیشتبای خۆم یان هەر بەو جۆرەی کە لە شەمادا نووسیومن دەیانتوسمەوە.**

**بە شادییەوە لە ژێر کەوانەی پیتە عەرەبییەکاندا دێم و دەچم ، واو بادەدەم رێ و سین دەسوڕێنم. هەر وەکوو دایکی بووکی کە لە شەوی زەماوەندا گوڵاوپژێنی جڵکی کچەکەی دەکا نقتە و خاڵ و لێرە و لەوێ دەپرژێنم.**

**بە هۆی خەتەوە مرۆڤایەتی خۆم دەردەخەم. هەروەها بۆم دەردەکەوێ کە پیتی عەرەبی وەکوو پیتی چینی هەموو پەسنی باخ و باخاتیان هەیە. پیتی چاپی سڕە بێلایەنە و خۆی بە هەموو کەس دەفرۆشێ. لە رۆژنامە، گۆڤار، راگەیەنەری بازرگانی، قاموس، چیرۆک، داستان پۆلیسی، کتێبی دەرسیی و بەیاننامە سیاسییەکاندا هەیە. بەڵام لە خەتدا جوانیی و دزێوی روخسار و کەسایەتی من هەیە. ئارامیی و نائارامیی، رەوشت و حالەتی رووخۆشیی و توند و تیژی و مناڵی و نەمامیی و گەنجی و پیری منی تێدایە.**

**خەت روخساری تریفەداری مرۆڤە.**

**کتێبی (قصائد متوحشە) – شێعرە قوشقییەکان– خۆشەویسترین کتێبی منە.**

**چونکە ئەو کتێبەم لە لەشی خۆم دەرکێشاوە. دوو ژانم پێوە دیون ، ژانی گۆرانی نێوخۆیی و ژانی منداڵ بوون.**

57

**ئەوین لە ئارەزوودا تا کوێ دەکشێ؟**

**– من خەتکێشێکم نییە کە ئەوین و ئارەزووی پێ ئەندازە بگرم.**

**ئەو دووە سەرکێشن و ئەندازە نادەن بە دەستەوە. بەڵام دەزانم کە ئارەزوو وەکوو زەڕەبین وایە، تشت بە شێوەیەکی ئەفسانەیی گەورە دەکاتەوە و بۆ باوەڕ پێکردن نابێ . هەر لەبەر ئەوەیە کە ئەوینداران لە**

بەردەمی خۆشەویستەکانیان بە شەکەتی و واق وڕماوی رادەوەستن و وادەنوێن کە زاری خۆشەویستەکانیان کۆلکە زێڕینەیە. و مەمکی داری دفلییە و دەستیشی پارچە زێڕە.
دیارە ئەوان بۆ ئەوەی دەیبینن دەیلێن هەقیانە.
ئارەزووەکان هەرگیز بۆ بەدرۆخستنەوە نابن.
لە بەر ئەوە هەوڵ مەدە لە گەڵ شاعیرێکی ئاشق لە سەر ئارەزووەکانی بکەویە دەمەتەقە.
چونکە ئەو لە پاپۆڕێکی ئاسمانگەر دایە و زەوی جارێک بەرەنگی بنەوش و جارێک لاجێوەردی و جارێک لە تەحر و بیچمی ئەنگوستیلەدا و جارێکیش بە شکڵی پرتەقاڵی دەبینی.
58
چۆن لە کەلەپوور و داب و نەریتی میراتی دەڕوانی؟
– کەلەپوور ئەو منداڵدانەیە کە ئێمە هەموویان لە نێوی‌دا پەروەردە بووین و جوانیی و دزێوی فەرهەنگی سەرەتایی ئێمە تێیدا شکڵی گرتووە.
ئەوانەی دەڵێن میراتێکمان نییە وەکوو ئەو کەسانەن کە دەڵێن دایکمان نییە. میرات هاوڕێیەکە خووی پێدەگرن بە راوێژ کردن لە گەڵ سەبوریمان بە دڵیدا دێ . پولیس نییە کەلەپچەمان لە دەس بکا و بە زۆر لە جێیەک رامان بگرێ.
من وا لە میرات دەگەم کە رووبارێکی مەزنە و ئێمە هەموومان لە ئاویمان خواردووەتەوە و پێم وا نییە کە گوڕێکی بەردە مەڕمەڕە و ئێمە ئارەزووەکانمانی تێدا دەشارینەوە.
میرات چاخ و پلەی یەکەمە . بۆ وێنە وەکوو سەردەمی منداڵی. مرۆڤ ناچارە پێدا راببرێ بۆ ئەوە بگاتە چاخی لاوی و کامڵ بوون و پیری. مرۆڤ ناتوانێ وەکوو پاڵەوانان باز بداتە سەر ترۆپک و کلاوەی کات و زەمان. ئێمە ناتوانین گرێی نێوک بپسێنین هەر بەو جۆرەی پەتی خوساو دەپسێنین.
هەر بەو جۆرەی کە ناکرێ تا بێبڕانە لە زەگی دایکماندا بمێنینەوە. هەروەها مانەوە هەتا "الی ماشأ اللە "ش لە زەگی مانگانەی وەحشیشدا ناگونجێ.
دیارە من "الحگیئە و الفرزدق و النابغەی زبیانی" لە داری بنەماڵە هەڵناپەڕتێوم، ئەوانە بمەوێن یان نەمەوێن باو و کاڵی منن، بەڵام لە سەر ئەوەش سوورم نە ئیزنیان لێوەرگرم و نە تەلەفونیشیان بۆ بکەم. هەر وەکوو ئەو کاتەی رۆنیشتم و شێعری ساڵی 1982م نووسی.
59
تۆ خاونی زۆرترین بڵاوکراوە لە نیشتمانی عەرەب دای ، هۆیەکەی چییە؟
– چونکە من شاعیرێکی سرووشتیم. بە زمانێکی سرووشتی دەنووسم و رووی قسەم لە مرۆڤی سرووشتییە.
ئەگەر ئەو خەڵکە دێن بۆ لای من لە بەر ئەوەیە کە لە وڵاتەکەی مندا خەڵک لە وەشەگەلێ دەگەڕێن هاوتایان بێ، هاوتای پێکەنینەکانیان ، هاوتای بیچم و شکڵی برینەکانیان و هاوشکڵی رۆژگاریان بێ.
وامەزانە خوێنەرێک لەو جیهانەدا فێڵ و تەلەتە و ناراستی قەبووڵ دەکا یان شتێک بە زۆر یان بە لارە ملی دەکرێ.
من زەنگۆڵە هەڵناگرم و بە شەقامەکانی نیشتمانی عەرەبدا ناگەڕێم داوا ناکەم خەڵک بێن و شێعری من بخوێننەوە. دڵی من زەنگۆڵەی منە و لە نێوان دەندەکانم دایە...خەڵکی جیهانیش بە باشی دەنگی لەرینەوەی دڵ دەبیسن. خەڵک بە شوێن کتێبدا دەگەڕێن، کتێب بە شوێن خەڵکدا ناگەڕێ. گەلۆ تۆ کتێبێکت دیوە لە خوانچەی کتێبخانە بێتە دەرێ و دواینی خوێنەرێکی گرتبێ و بۆ کڕینی لێی پاڕابێتەوە؟
لە بەر چی بڵاوکراوەی من لە هی هەمووان زیاترە ؟
ئایا بڵاوکی زۆر تاوانە و شاعیر دەبێ بەرپەرچی داتەوە یان لە بەر ئەوە داوای لێبووردن بکا؟ کاتێ سەرکەوتن لە وڵاتەکەی تۆدا قەدەغەیە ، تۆ تایبەتمەندی باشترت هەیە هەر پرسیارێک شیاوی هێنانە گۆڕێیە و هەر سەرکەوتنێکیش شکڵی تاوان بە خۆیەوە دەگرێ.

من خاوەنی زۆرترین کتێبی بڵاوکراوەم چونکە کاری من یاریگەری تئاتر نییە. روخسارم بە پودر ناساوم لە گروپی "حسب اللە" یان لە تئاتری دیکەدا یارەی ناکەم.
لە ژیانمدا وشە دوو لەت ناکەم. راستسیش ناکەم بە دوو لەتەوە. وشە بۆ بەش کردن نابێ. راستیش هەر وایە بۆ بەش کردن نابێ. هەر وەکوو بۆ من نالوێ بە نیوەی زارم ژنێک ماچ کەم ، هەروەها بۆم ناکرێ بە نیوەی قامکەکانم بنووسم .
نووسین سەرکەوتنە، شەق کردنە و خۆ لە مەترسی هاویشتن.
ئەو نووسەرەی داوا لە پۆلیسی ئەمن و پاراستن دەکا کە بەر لە نووسینەکەی بچێتە سەر قامکەکانی وەکوو ئەو نیارڤانەی سینەمایە کە داوای پۆلیسی ئەمن و پاراستن بۆ سەر لاقەکانی دەکا بەر لەوەی سەما بکا.
ئەو شاعیر و هەڵبەستڤانەی کە لەو قۆناغە گڕدارە مێژووییەدا بە مەتەڵۆکە و قسەی پچڕپچڕ بە زمانی بزماری کە خەڵک تیی ناگەن روو دەکاتە خەڵکی عەرەب و لە گەڵی دەدوێ. ئەوە شاعیرێکی لە سەربازی راکردووە و شیاوی ئەوەیە لە گرتووخانەیەکی تاریکی وەکوو ئەو زیندانانەی ئێمە تیاندا بەند کراوین زیندانی بکرێ.کاتێ تۆ لە گەڵ خۆت و لە گەڵ خەڵکدا راست بێ ، بێگومان پێدەگەی. ئەگەر نەتوانم شێعری خۆم لە کەسانی دیکە بگەیەنم، ئەوە خەتا و تاوانی منە نە هی کەسانی دیکە. ئەوە لە ئەستۆی منە و پێویستە ئاوڕ بدەمەوە سەر کەرەسەی شێعریی خۆم بۆ ئەوە بۆشاییەک بدۆزمەوە.
ئەوە ئەو دەستوور میزانەیە کە بۆ هەموو نوسراوەکانم بە کاری دێنم.
خوێنەریش بەردەوام خاوەن حەقە. چونکە ئەویش شەریک و نیوە کاری شێعری منە و شاعیر مافی ئەوەی نییە خوێنەرەکەی راو نێ، یان بە کەمی بگرێ یان بە باشی رەفتاری لە گەڵ نەکا. دەنا هەڤبەشینەکە تێک دەچێ و دەسووتێ.
ئەو کاتەی لە ریزی دیپلۆماتەکان خۆم کێشایەوە دەمویست بە گژ هەموو ئەو کەسانەدا بچمەوە کە دەیانوت شێعر پارو نانێکی لێ هەڵناوەرێ. و ئەگەر شاعیر بیەوێ لە سەر پای خۆی راوەستێ، ناچارە ببێتە مەیتەری رەوە ئەسپی پاشا. بەڵام ئێستا هەر بە بەرەکەت و گەورەیی و کەرامەتی شێعر و بێ ئەوە ببمە مەیتەری کەسێک لە سەر پێ خۆم راوەستاوم.

60

بە سونگەی چەند بابەتی دیکەوە لە مەوبەر گوتووتە تۆ شاعیری سەت و پەنجا ملیۆن عەرەبی. گەلۆ پاڵپشتی ئەو ئیدیعایانە بڕوا و متمانە بوون بە خۆ بوونی لە رادە بە دەرە، یان ئەوە چەشنێک ئاماژە و ئیشارەتە بەو راستییە کە شێعری نزار قەبانی بایەخی شێعری عەرەبی زیاد کردووە؟
ئەوەی گوتوومە متمانە بە شێعرە نە بە خۆ. من هەرگیز بە دەستی خۆم لە دەرگای سەت و پەنجا ملیۆن عەرەبم نەداوە. ئەوە شێعری منە چووەتە زیارەتی ئەوان.
کاتێ خەڵک دەرگای خۆیان بۆ شێعر دەکەنەوە مانای ئەوەیە شێعر شتێکی بۆ ژیانی ئەوان پێیە یان شتێک لە تەمەنی ئەوان زیاد دەکا.
ئەو هەڵبەستانەی رۆژگاری خەڵک ناگۆڕن، رێگە و ئاسۆیەکیان بۆ ناکەنەوە یان دەنگیان دەرنابڕن یان لە مرۆڤایەتییان نادوێن، رێگەیان پێ نادرێ و هەمیشە لە پشت دەرگا دەمێننەوە. گەلۆ ئێوە شتێک لە غەریبی و بیانی بوونی دەفتەر و پەرتووکان دەزانن؟
ئایا ئێوە لە ئێش و ئازاری ئەو روپەڕانەی کە خوێنەریان نییە ئاگادارن؟ هەروەها لە رەنج و دەردی ئەو شێعری مرۆڤێکی دەس ناکەوێ بە سەریدا ببارێنێ یان لە سەر ئەژنۆکانی بنوێ خەبەرتان هەیە؟
من دەچمە لای خەڵک و شێعری خۆمیان بۆ دەخوێننمەوە، بۆ ئەوەی خۆم لە هەزار نێزەی کە برینم تێدەکەن بحەسێنمەوە و دەیان بزماری راچوو لە گۆشتم دەربێنم. چ چارە رەشە ئەو شێعرەی ناخوێندرێتەوە!
تام و چێژی لە گەرودا دەبێتە تام و چێژی مەلێکی مردوو.

61

هێرشت دەکەنە سەر کە هەزار دیوانی شێعری خۆت دەفرۆشی...هەروەها دەڵێن گوایە بە هۆی شێعرەوە دەوڵەمەند بووی؟

خانمولە! ئەوە لە کەمیی ئەدەبی منە و ئەوەم لێ مەگرە!

ئالەم نیشتمانەدا شاعیر مافی ئەوەی نییە کەوشێکی نوێ بکڕێ یان کراسێکی تازە لەبەرکا. ئەگەر لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا یان لە فەرەنسە یان ئینگلترا کتێبێک بیست میلۆنی لێ دەفرۆشێ، لێی بۆ تەپڵی شادمانی دەدرێ و بەرهەیوان و تاقی سەرکەوتنی بۆ دەڕازێننەوە ، بەڵام ئەگەر شاعیرێکی عەرەب بتوانێ پێنج هەزار دانە لە کتێبەکەی بفرۆشێ، تازییەی گشتی رادەگەیەندرێ.

ئەمن یەکەم شاعیری عەرەبم کە ئەو کەرامەت و گەورەییەم پێدراوە کۆتایی بەو ئەفسانەی سواڵکەری شاعیری عەرەب بێنم.

شاعیری عەرەب ئەمرۆ لە سەر لاقی مەزنێتی و کەرامەتی خۆی رادەوەستێ. ئەگەر شاعیری پێشوو دەرکەوانی بەر دەرگای خەلیفە بوو ئەمرۆ خەلیفە بووەتە دەرکەوانی بەردەرگەی شاعیر .

بەڵام ماڵ و سامانی من پاش چل ساڵ داچۆڕانی خوێنم بە سەر دەفتەراندا ناگاتە سامان و دارایەتی لولەکێشێک کە شێرەی تەقیوی ئاوی ماڵەکەمان بۆ چاک دەکاتەوە یان ناگاتە سامان و ماڵی گچکە ماڵکرِ و ماڵ فرۆشێک یان دەڵاڵ و بازرگانێکی چەک لەم سەردەمە پیرۆز و بەبەرەکەتەی عەرەبدا.

من مانگانەی قوتابخانەی منداڵەکانم و پارەی کارەبا، دەرمانفرۆش و تەلەفون بە رێک و پێکی دەدەم.

بەڵام ناتوانم لە گەڵ خزم و کەس و دەست و پێوەندییەکانم بچمە" کوت دازور"، دوورگەی "کاپری" یان"لاس ویگاس" و "هونولولو".

ئەم جێگە ئەفسانەییانە ویزایان بە داهاتی نەفت دەدرێ نە بە داهاتی شێعر .

62

ناوت بە قەیرانی شێعرەوە لکاوە. هەر وشەیەکی بڵاوی دەکەیەوە کاردانەوەیەک لە نێوان لایەنگر و نەیاری تۆدا پێک دێنێ. تۆ بۆ چی بە تەنێ و جیا لە شێعرەکانی دیکە لە سەر نووکی خەنجەر رادەوستی؟

– ئەو هێرشانە بوونەتە بەشێک لە لەشی من تەنانەت خووم پێگرتوون و هەستێکم بۆیان نەماوە.

لە ساڵی 1964ەوە لە زاری هەژیها دام. ناو نیشانی من بەردەوام نێوان دانی هەژدیهایە و ناو نیشانێکی دیکەم نییە.

ئێرنێست همینگویی دەیگوت :" نووسەرە راستەقینە ئەو کەسەیە کە لە سەر هێڵی نێوان مان و نەمان راوەستێ.

کاتێ بتەوێ جیهانێکی نوێ لە سەر وێرانەی جیهانێکی کەون دامەزرێنی هەموو کۆسپێک دیتە رێ و هەموو دارە هەڵقەندراوێکت لە بەردەم دەچەقێ و هەموو دەروێشەکان بە دژی تۆ دچنە خۆپیشاندان . چونکە تۆ نانی ئەوانت بڕیوە و خێوەتەکانیانت سووتاندووە.

من وێک کەوتن و پێدادانم لە گەڵ دەروێشان بەردەوام بووە.

دەروێشەکانی دوێنێ بنەبڕ بوون ، بەڵام دەروێشەکانی ئەمرۆ جلْ و بەرگی پێشەوتوویان لە بەر کردووە. پلاکاتی چەپییان بەرز کردووەتەوە، لە قانوونی مارکسیستی و رێکەوەندی راستەقانیی مارکسیستی کەڵک وەردەگرن.بەڵام توانی ئەوەیان نییە لە گەڵ کرێکارێکدا لێک حاڵَیَ بن یان لە وەرزێرێک تێبگەن.

63

گەلۆ رەخنە گرتن کارت تێدەکات؟

رووکاری ئەو دیوی شەپەڵاغە ماچە. مێژووی شێعری من بە تەواوی لە سەر یاری ناتەباییەکان داندراوە.

من وەنازانم زیندووم مەگەر بەردێک بە شووشەی پەنجەرەکەم دادرێ. لەو کاتە دایە کە دەزانم ئەو جۆرە شێعرەی من پیشکەشی خەڵکم کردبوو کاری کردووەتە سەر گەڕانی خوێنیان و هەژان و بومەلەرزەیە ی کە لە نێو خۆمدا رامگرتبوو بۆ ئەوانم ناردووە.
کاتێ شێعرێکم بڵاو دەکەمەوە و بە هۆی ئەوەوە بەردباران ناکرێم تێدەگەم نەخۆشم و پلەی گەرمای لەشم دەچێتە سەرێ.
رەخنە لە جیهانی سێهەمدا مانای ئەوە نییە تۆ تێشکاوی، بەڵکوو مانای ئەوەیە کە تۆ سەرکەوتووی.
رەخنە قوتابخانەیە و شاعیر قوتابییەکە و هەرگیز لێی دەرناچێ و بەردەوام پێویستی بە زێدەزانین و کۆکردنەوەی ئەزموون هەیە.
کاتێ شاعیر بەو قەناعەتە بگا کە بووەتە ئەنسیکلۆپیدایی شێعر و هومێری زەمان فاتیحە بۆ خۆی و بۆ شێعرەکەی بخوێنە.
بەڵام بە گشتی رەخنە لە وڵاتە عەرەبییەکاندا شتێکی عەشیرەتییە. پێوەنتدی بە خوو و خەدە و کارتێکردن و وەرگرتنی ئەو تشتەوە هەیە . ئەوەش مجەمەیەکە و هەموو رۆژێ گۆشتی کاڵی لە سەر دەخورێ.
ئێمە کتێبی شێعر گوڵلە باران دەکەین بەر لەوەی بیخوێنیینەوە . شانۆگەری و نیارنانە هەڵدەسەنگێنین بەر لەوەی ببینین. ئاور لە نیگار و نیگارە بەر دەدەینبەر لەوەی سەریری بکەین.
رەخنە لە وڵانی ئێمەدا یان لە زۆربەیاندا کوشتارگەیەک وەکوو هەموو کوشتارگە سیاسییە و عەشیرەتییەکان. پێشتترین و پرمەترسیترین چەکی تێدا دەکا دەکرێ. بۆ کەسێکی بە شێوەی ژیاریی و پێشکەوتووانە هەلەم بۆ راست کاتەوە گوێی بۆ رادەگرم بەڵام گوێ نادەمە هەرا و هوریای وەحشییانە.

64

لەو چاخ و سەردەمەی ئێمەدا چەمکی داهێنەرانە و چەمکی سیاسی تێکەڵ بوون. زۆر وابووە دووهەمیان بە سەر یەکەمیندا زاڵ بووە. لە کاتێدا رەخنە گرتن رەمەکی و هەرچی و پەرچێتییە ئەگەر نەلێین بە کەیفەیە. ئێمە چۆن شێعر لە نە شێعر جیابکەینەوە؟
کاتێ شێعر شکڵی"پەر" بە خۆیەوە بگرێ و جڵی پنوک پنوک ببێتە پێوەری شێعری شۆڕشگێڕانە ، ئەو کاتە فاتیحەی شێعر و شۆڕش وێکڕا بخوێنە.
درووشمی سیاسی نە هەر شەقامەکانی داگرتووە بەڵکوو روخساری شێعریشی داپۆشیوە. ئەزموون و تاقیکاری نیشانی داوە ئەوەی لە جەژنی شێعری شۆڕشگێڕانەدا کوژراوە هەر شێعر بووە.
نێوەرۆکی سیاسیی بۆ شێعر چ بەرز بێ و چ نزم بۆ دەرچوون لە ئەزموون و تاقیکاری شێعر بەس نییە.
زۆر وا بووە نێوەرۆکێکی سیاسی بۆ شێعر لە سەتا سەتی دەرەجەی وەرگرتووە ، بەڵام ئەوە بۆ دەرچوون لە تاقیکاری و ئەزموونی شێعردا بەس نەبووە.
خەڵکی عەرەب وشیارە و نیشانی داوە گوڕاندن شێعر نییە. شریتی پڕ لە درووشم ، لاسایی کردنەوە و عەوام هەڵخەلەتاندن کەسی سەرخۆش نەکردووە.
هات و هاوار و گوڕاندن هەر چەندی کێشدار و بەسەروا واتە خاوەن قافیە بێ یان بێ سەروا و بێکێش بێ بە جل و بەرگی کاکیی واتە نیزامییەوە نابێتە شێعر .

65

شێعری لاو دەیەوێ بە خێرایی خۆی وەکوو جێگری رەوتی بزووتنەوەی شێعری نوێ بخاتە روو. ئایا ئەو دەنگانە مزگێنی ئەوە دەدەن؟ یان زۆربەیان لادانێکن لە رەوتی دروشمیی و رەمزیی و تەلەسم و مەتەڵ و بە هەموو ماناوە لە شێعردوور کەوتوونەوە؟
هەر بەو جۆرەی کەس ناتوانێ پێش بە ئەسپێک بگرێ کە لە مەیدانی کێبەرکێدایە و دەیەوێ لەو رکەبەرییەدا سەرکەوێ هەر بەو شێوەش کەس ناتوانێ ببێتە لەمپەری شاعیرێکی بەتوانا کە لە مەیدانی شێعردا کەوتووەتە رکەبەرییەوە.

ئەوە مافێکی شرووشتییە و من لایەنگری هەموو ئەسپێکم کە بە لێوەشاوەیی و خۆشڕەوتییەوە رادەکا، بەلام ئەوەش دیارە کە هێندێک لەو ئەسپانەی بە دزییەوە خۆیان خزاندووەتە نێو مەیدانەوە هەر بە کاری ئەوە دێن مازوویان پێ بشکێنن و باریان لێ بنێن.
هەر بەو شێوەی کە ئەسپی رەسەن لە گەڵ بارگینان تێکەڵ بوون، دەفرەکەش لە لە گەرماڤی شێعری نوێدا زایە بووە.
ئەمن بە شوێن کێبرکێوەم و سەرسوڕمانی خۆم لەو چەند ئەسپەی شێعر و لە رەوتیان و رێک و پێکیی هەنگاوەکانیان ناشارمەوە.
لە یاریگەی شێعری نوێدا هەرچی و پەرچێیەتی حاکمە و دەبێ سەرەنجام رۆژێک دابێ لەو یاریگایەدا جیا لەو رەوە ئەسپە خۆشبەز و خۆشڕەوتانە کە بە هەوایەکی جوان سەما دەکەن ئەسپی دیکەی لێ نەمێنێ. ئەو رەوە ئەسپە تەپلۆسە لەش داکەوتووەش بگەڕیتەوە سەر کاری پێشووی خۆی واتە دابەش کردنی تەنەکەی رۆن بە سەر مالاندا.

66

فەلسەفەت لە ژیاندا لە فەلسەفەی وجوودی نزیکە، شێعرەکانیشت لە سەر ژن، پچشتیوانی لە ئازادی بێ لەمپەری مرۆڤ دەکەن. تۆ چۆن لە ئازادی داهانین دەڕوانی و بۆ دابین کردنی هەڵ و مەرجی ژیانی مرۆڤانە بۆ ژن چ دەفکری؟
کاتێ داوای ئازادی بۆ ژن و نیشتمان و وشە دەکەم، ئەو داوایەی من چەمکەکەی هەموو لایەنە، گشتی و بێ لەمپەرە. چونکە لەوێدا نێوە ئازادی و چوار یەکی ئازادی و ئازادی بە پێخور نییە. لە کاری داهێناندا رێگە بە هیچ دەسەلاتدار و هێزێک نادەم لە سەر قامکەکانم دانیشێ و نژوەم پێبکا کە چ بنووسم و چۆن بنووسم.
ئەو شێعرەی نەتوانێ بە هەموو ئالییەکدا بێ و بچێ ئەو شێعر نییە، ئەوە مشکە و بە تەلەوە بووە.
ئەو ئازادییەی بۆ ژن دەیەوێ ئازادی بە ئەنجام گەیاندنی ویست و مافی و مرۆڤایەتییەتی. ئازادی و رێگەپێدانی بۆ رووبەروو بوونەوە لە گەڵ بەرپرسایەتییەکانی، بێ ئەوەی سەری ببڕدرێ و بخرێتە سەتلی زبلەوە.
ئەوانەی دەلێن ئازادی بۆ ژن پڕمەترسییە ، پێیان دەلێم کە ئازادی پیاو لە هەلسەوکەوتیدا و لە ئەنجامی ئەوەی دەیکا بە درێژایی مێژوو پڕ مەترسیتر بووە.
هەموو شەڕ و کوشتارەکانی ئەم جیهانی پیاو کردوونی یەک تاقە ژنیش ئاگری شەڕی هەلنەگیرساندووە، شارێکی کاوڵ نەکردووە، یان دیلی نەکردووەتە خوراکی دڕندە.
بە کورتی ئازادی وەکوو ئاسمانە، شەوە، دەریایە، دابەش کردن قبوڵ ناکا و نزم کردنەوە و چەنە لێدان هەلناگرێ.

67

سەرەڕایی "گەلیی بوون"ی نزار قەببانی ، ئێستاش هێندێک رەخنەگران وایدادەنێن کە زمانی نزار قەببانی هی چلەکانە و لە ژێر کار تێکردنی زمانی "امین نحله بشاره الخوری، سعید عقل و صلاح الدين لبکی" دایە. رات بەرامبەر بەو وتەیە چییە؟
- شتێک بە ناوی زمانی چلەکان و پەنجاکان و حەفتاکان نییە.
زمان کەوش نییە کە هەموو سالی یان هەموو مانگێ بە کەوشێکی تازەی وەگۆڕین.
زمانی " گە حسین زمانی گە حسین "ە.
زمانی "ئاندرە ژید زمانی ئاندرە ژید"ە.
زمانی "تولستوی هی تولستوی" یە.
زمانی "مایاکوفسکی هی مایاکوفسکی"یە.
زمانی "محمد جواهری هی محمد جواهری"یە.

**ئێمە ناتوانین بە ناوی نوێ بوونەوە داوا بکەین شاعیر جلەکانی لە بەر داماڵێ و بەرگ و پیتاکی "بیتڵز" لە بەر کا و بە موسیقی دیسکۆ هەڵپەڕێ.**
**زمانی هەر نووسەرێک تایبەت بە خۆیەتی، وەکوو شوێنی پەنجە مۆرەکان، رەنگی چاوەکانی و درێژایی باڵای .**
**ئەگەر " اسکار وایلد" یان هۆمەری کوڕی رەبیعە لە زمانەکەیان داتەکێنن، رووت و قووت دەمێنێتەوە.**

68

**بە بەراوردی تۆ شێعری نوێ گەیشتووەتە کوێ؟**
**– شێعری نوێ هەروا لە پاسپۆڕتێک دەگەڕێ کە لە سەردەم و چاخێکەوە بۆ سەردەم چاخێکی دیکە بچێ.**
**شێعری نوێ بە بەرگەی هاتووچووی کاتییەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەچێ. هێندێک لەو بەرگانە بایەخدارن و هێندێکیان ماوەیان بە سەر چووە. بەشێکیان ئینگلیزین و تاقمێک فەرەنسی و هێندێکیان دووڕەگەن.**
**شێعری نوێ هێشتا پاسپۆڕتی عەرەبی پەسنکراوی نەدراوەتێ. بۆ پەسن کردن و دانی ئەو پاسپۆرتە بە شێعری نوێ ماوەی گەرەکە.**

69

**لە شێعردا دەتەوێ تا کوێ بچی؟**
**– دەمەوێ بچمە ئەو شوێنەی باران دەچێ.**
**دەمەوێ بچمە لای بچوکترین تۆزی خاک خۆڵی ئەم نیشتمانە و پێی بڵێم : خۆشم دەوێی.**
**دەمەوێ قوتابخانەیەک لەو مەڵبەندە عەرەبیانەدا بکەمەوزە کە هەروا لە نەزانیی و نەخوێندەواریدا دەژین.**
**دەمەوێ لە ئەردی نیشتمانی عەرەبدا دارێک نەبڕَدێ، رووبارێک وشک نەکرێ، مەمکێک نەبڕدرێ. مەمکێک نەکوژرێ و کتێبَیک نەسوتێندرێ.**
**دەمەوێ خۆشەویستیش وەکوو راهێنان و فێر کردن بۆ ژن و پیاو لە باخچەی منالان ڕا هەتا زانستگە بە خۆڕایی بێ.**
**لەم نیشتمانەدا پیاوێکی نەخوێندەوار نەمێنێ و ژنێک نەبێ کە حەز لێکردوویی نەزانێ؟.**

70

**دەڵێن ئەوانەی کە لە ئیشارەت و ناسک و شلکی شێعری نوێ ناگەن باسی کەم و کوڕی ئەو شێعرە دەکەن و لێی دەسلەمێنەوە لە بەر ئەوە داوا دەکەن ئەو حەساسییەتەی خەڵک بگۆڕدرێ تا بگەنە پلە و رووبەری شێعری نوێ بە بڕوای تۆ ئەوە دەکرێ؟**

- **ئەگەر بکرێ و بلوێ پێستی رەشێکی ئەفریقایی بگۆڕدرێ و بکرێتە سووری مەیلەوە زەرد، ژنێکی سوئێدی بکرێتە ژنێکی سوودانی و سەرمایی ئاسایی ئینگلترا بە هورموون بگۆڕدرێ، من بە دووری نازانم عەرەبێک رۆژێک لە خەو راست بێتەوە ببینێ کە بووەتە ئەندامی کۆڕی نووسەرانی سۆفێت.**
- **حەساسییەتی گەڵیک بۆ شێعر هەر لە بەر ئەوە کە شاعیرێک یان دوو یان سێ شاعیر دەیانەوێ 180 دەرەجە ناگۆڕدرێ.**
- **نوێ کردنەوەی شێعر نەشتەرگەری نییە کە بە چەند سەعاتان پیو بە ژن بکرێ، ژن بکرێتە پیاو . نوێ بوونەوەی شێعر کارێکی نەپساوی رۆژانەیە و لە دەروونی ئێمەدا دەکرێ.بێ ئەوەی ئێمە بیبینین بێ ئەوەی بتوانین پەلەی لێ بکەین. وەکوو زستان کە ماوەی گەرەکە تا زەوی ئامادە بک. هاوینیش کات و ماوەی گەرەکە تا بەر و میوە پێبگەیەنێ. هەروەها بەهار زەمانی دەوێ تا ئەو هەموو دیمەنە جوان و رازاوەیەی بەلێنی دابوو برازێنێتەوە.**

وەرزەکان تێک نائاڵقێن و لە سەر یەک کەلەکە نابن و دژایەتی یەکتریش ناکەن مانگی تشرین جێگەی تەمووز ناگرێتەوە، نیسانیش ناچێتە جێی ئەیلوڵ. جا بۆچی شێعری نوێ دەیەوێ هەموو مەقام بێژ و بەستەبێژ و مشتەرییەکان وەدەرنێ و بەتەنێ بۆ دار و دیواری بلێ؟

شێعری "عمودیە" دەستی کردووە بە کوَکردنەوەی جلو بەرگەکەی و لە زووەوە بارگە و بنەی تێک ناوە و جانتاکانی خۆی پێچاوەتەوە. نە شیاوە و نە کەرامەتی ئەخلاقی تێدایە کە ئێمە جڵ و بەرگ و پرێسکەکانی لە پەنجەرەڕا فرێ دەین و بەو بیانووە کە قەرار و بریەی ئیجارە لە نێوان ئێمە و ئەودات کۆتایی پێهاتووە. و لە ئەستۆیەتی دەم و دەس شوێنی ئیجارەکە بە جێ بێلێ.ئەم هەڵوێستە دژایەتی لە گەڵ هەموو پرێنسیپ و ڕێ و شوێنێک هەیە.

پاشان شاعیرە نوێ نووسەکان بە لە سەرەخۆییەوە بێن و خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەوە مزڵ و ماڵی باوکیان وەرگرن، دەس بە سەر شتەکانیدا بگرن و بە خاوەنیان بکەن. بەڵام بێ ئەوەی کەتنی کوشتنی دای و باویان بە ئەنجام بگەیەنن.

71

ئەرکی شاعیر لە هەموو کاتیدا و بە تایبەتی لە کاتی ناخۆشیدا چییە؟

ئەرکی شاعیر ئەوەیە ببێتە کەرەسەیەکی چاڤدێری ئەوتۆ کە هەموو شەپۆڵ و هەژان تەقینەوەیەک لە نێوخۆی زەویدا و لە دەروونی‌دا و لە دەروونی مرۆڤدا پەیدا دەبن ، بگرێ.

پێویستە دام و دەزگای دەماریی و "عصب"ەکانی شاعیر بیستو چوار سەعاتە لە حالەتی چاودێریدا بن بۆ ئەوە هەر هەژانێکی کە لە نێوخۆی زەویدا روو دەدا تۆماری بکەنهەر وەکوو رەوە ئەسپ کە بەر لە بارینی باران هەست بە بارینی باران دەکەن.

ئانتینەکانی شاعیر ڕێگەی بۆ دەکەنەوە زووتر و خێراتر و بە هێزتر لە خەڵکی دیکە ببیسێ. لەو رووەوە و بەو مانایە ئەوە سەروی پێخەمبەرانەیە.

شاعیر نە ئەستێرە ناسە و نە سیحرباز و نە کلێلی غەیبی پێیە. بەڵام گرینگییەکەی لەوە دایە ئەو بە چرکەیەک یان لە چرکەیەکیش زووتر لە خەڵکی دیکە لە راستەقانی ئاگادار دەبێ و ئەوەیان لە سەر کەشفی سەرسوڕمان پێشکەش دەکا.

72

چ کەمایەسییەکەت هەیە؟

– هەست بەو کەمایەسییە دەکەم و بە پێویست دەزانم کە نیشتمانی عەرەب بۆ پێشوازی کردن لە شێعر 21 گوڵلەی تۆپ بتەقێنێ و لە ژێر پێی شێعر فەرشی سوور رابخا.، گاردی ئیحترام هەر وەکوو بۆ سەرۆک کۆمار پاشایان ریز دەبەستن بە ئیحترامەوە بە ریز لە بەردەمی راوەستن.

73

پێت وایە چ هەڵوێستێکت قارەمانانەیە؟

هەر کاتێ کتێبێک لە لە شێعری خۆشەویستی و دڵداری‌دا بڵاو دەکەمەوە پێم وایە قارەمانم.چونکە لەو باوەڕە دام کە نووسینی کتێبی دڵداری لەم ناوچەیەدا ئەوپەڕی قارەمانەتییە.

74

لەم چاخە دژوارەدا کە شاعیری راستەقینە لە هەموو لایەکەوە بە خەنجەر گەمارۆ دراوە و شێعریش ئەو دەنگە جاروبار گڕگرتوو و زۆرجار شێتەیە، تۆ لە مەڕ لابردنی گەمارۆ و لە سەر شێعر و شاعیر چۆن دەفکری؟

– ڕێگە چارە ئەوەیە کە کێرد بەو قەناعەتە بگات کە گوَشتی شاعیر نە بە کاڵی، نە بە کوڵاویی و نە بە برژاویی دەخورێ.

تا ئەو کاتەی کێرد دەسەڵات جیاوازییەک لە نێوان گۆشتی وشە و گۆشتی فروج دانانێ و فەرقیان پێ ناکا، ڕێگەی بە یەک گەیشتن لە یەک گەیشتن بەستراوە.

**له باری مێژووییەوە چ هیوایەک نییە برنامەیەک یان پەیمانێکی شەرافەتمەندانە لە نێوان پاشا و نووسەردا ئیمزا بکرێ.نووسەر لە ترووپکی شانازی کردن بە خۆیەوە خۆی بە سوڵتان دەزانێ و سوڵتانیش لە مزڵی دەسەڵات و هێزەوە وای بە خەیاڵدا دێ کە دەنگی خۆشە و لە توانایدا هەیە ستران ببێژێ و بنووسێ. ئالێرەدایە کە ئەو هێزانە دەکەونە ناتەباییەوە. حاکم لە کاتی دەسەڵاتداری خۆیدا دەسەڵاتی کەسی پێ قبوڵ ناکرێ. نووسەریش هیچ دەسەڵات و هێزێکی راستەقینە قبوڵ ناکا. لەبەر ئەوە نووسین لەو چاخەدا دژوارە و ئەرکێکی گرانە.**

75

**ئایا دیوارت بە دەوریدا کێشاوە؟**

**تا ئەو کاتەی فێر دەبم کتێبێک بۆ بەرێوە بردنی کار و باری ماڵەکەم بنووسم و شێوەی درووست کردنی مایونێز و ماسی فێر بم دەورم گیراوە.**

**هەتا فێر دەبم چۆن لەگەڵ زارۆکان بە شێوەی (بابا روشا) بدوێم گەمارۆ دراوم هەتا فێر دەبم چۆن دەسەرە هەڵگرم و لاقی سوڵتان بە گوڵاو و ئاوی گەورەیی بشۆم ، دەورم گیراوە.**

**هەتا فێر دەبم کەلامێکی بێ رەنگ  بنووسم کە تام و بۆنی نەبێ و خوێنەرەکانی خۆم و بە شێعر و پەیڤی خۆم بەوەی لە بەر دەستم دایە یان بە بابەتی کەون بیان خاپێنم دەورم گیراوە. بەڵام وشە سەرەرای بزمار و سەر نێزە و کابلی کارەبا و گەماڵی باش راهێندراوی پۆلیس و کەرەسەی گوێ راگرتن و میوانی نەخوازراوی تاپو و بوومەلێڵ دەزانی چۆن بە دبدوکی تیژ و پۆلایینی ، تویکڵی هێلکە بشکێنێ . دەزانی چۆن خۆی بخزێنێتە ئەو شوێنانەی کە ئاویان پێدا دەروا و سەر لە بەیانی و لە کاتی خۆشوتن لە حەمامدا سوڵتان خافڵگیر بکا. .**

76

**تۆ لە شێعری ئەوینداریدا شاعیرێکی توورەیی، لە شێعری سیاسیشدا شاعیرێکی توورەیی . توورەیی تۆ لە کوێرا دەس پێدەکا و لە کوێ کۆتایی پێدێ؟**

**– دژوارە من یتوانم سنووری و کەوشەنی توورەیی خۆم دیاری بکەم . تا ئەو کاتەی ئیسرائیڵ هەموو رۆژی بەشێک لە مێژووی من هەڵدەپاچێ . بەشێک لە جوغرافیای من دادەبرێ بەشێک لە کتێب و دەفتەر و دادەێی مندالەکانم، هەڵدەپەرتێوی تا ئەو کاتەی مناڵانی عەرەب بە فرۆکە ئێف 16 دەدروێنەوە، توورەیی من دەریایە و روخی نییە.**

**لێم دەپرسێ لە بەر چی دەس بەرووەوە دەنێم؟**

**منیش بە نۆبەی خۆم لێت دەپرسم لە بەرچی قبوڵ بکەم و چی قبووڵ بکەم؟**

**گەلۆ من کڵاوی رێز و ئیحترام بۆ ئەو دەولەتوکانە بەرز کەمەوە کە وەکوو کەلەشێر بە یەکتردا هەڵدەپرژێن و هەتا ملان لە ئێرەیی و خۆبە زلزانی و خۆپەرەستییدا نوقم بوون؟ ...**